د. سالار باسیره

# پێگەی حیزب لە سیستەمی سیاسیدا

## لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی و شیکاری



پێگەی حیزب لە سیستەمی سیاسیدا

د. سالار باسیره



د. سالار باسیره

حیزبی سیاسی وەك ڕێکخراوێکی سیاسی/ کۆمەڵایەتی یەکێکە لەو بابەتە گرنگانەی لە بواری زانستی سیاسی و کۆمەڵناسی سیاسیشدا مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ و ڕەهەندی سیاسی و یاسایی و کۆمەڵایەتی هەیە. حیزب لە پێناو گەیشتن بە دەسەڵات خەبات دەکات و پردی پەیوەندیشە لە نێوان دەسەڵات و کۆمەڵ. دیموکراسیەتی هاوچەرخ بێ حیزبی سیاسی مەحاڵە. ئەو کۆمەڵگایانەی لەژێر سایەی سیستەمی دیموکراسی گوزەر دەکەن حیزبی سیاسی تێیدا لە سەرجەم پرۆسە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکاندا ڕۆڵی گرنگ و فراوان دەگێڕێ. هەڵبژاردنی حیزب لە سیستەمی دیموکراتیدا فاکتەرێکی گرنگە بۆ ئەوەی حیزب نەبێتە دیکتاتۆر. حیزب ئۆرگانێکی گرنگە بۆ بەمۆدێرن کردن یان پاشخستنی سیستەمی سیاسی. هەربۆیە لەم بوارەدا گرنگیدان بە ڕۆڵی حیزب و ڕێکخراوی سیاسی پێویستە بەتایبەت گرنگیدان بەئایدۆلۆژیای ئەو حیزبە. بەمۆدێرن کردن پێویستی بە هوشیاری کۆمەڵایەتی هەیە کە یارمەتی کۆمەڵ ئەدات بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانی بەمۆدێرن کردن. ڕێفۆرم کردنی سیستەمی سیاسی بەر لەهەر شتێك پێویستی بە ڕێفۆرم کردنی حیزب هەیە چونکە حیزب ڕۆڵی گرنگ دەبینێت بۆ بە مۆدێرن کردنی سیستەمی سیاسی.

لە دونیای مۆدێرندا سیمای گرنگی حیزب ئەوەیە ئامراز بێت نەك ئامانج. حیزب لە خزمەتی نیشتیمان و کۆمەڵدا بێت و لە ڕێگای دامەزراوەکانی و بەرنامەکانیەوە بتوانێت ئەرکەکانی خۆی وەك دیموکراسیەت و بوارە نیشتیمانیەکان بە ئەنجام بگەیەنێت.



لەبڵاوکراوەکانی
دەزگای ڕۆشنبیریی جەماڵ عیرفان
لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسول) چاپکراوە

ناوی کتێب

پێگەی حیزب لەسیستەمی سیاسیدا

نووسەر

د. سالار باسیره

دیزاینی بەرگ و ناوەوە:

ئومێد محەمەد

تیراژ: ۱۰۰۰ دانە

نرخ: دینار

ژمارەی سپاردن

( )ی ساڵی ( ) پێدراوە

سەرپەرشتیاری کتێبەکان

بەختیار سەعید




لەبڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیریی جەمال عیرفان ۲۰۱٤

ناونیشان: سلێمانی - کاسۆ مۆڵ - بەرامبەر مزگەوتی گەورە - نهۆمی چوارەم

سوودو سەرمایەی ئەم بڵاوکراوانە بۆ کەسوکاری شەهیدان و ئەنفال کراوانە.



لەسەر ئەرکی (د. تەها رەسوڵ) چاپکراوە

ئەم کتێبە پێشکەشە بە برا خۆشەویستەکەم دوکتۆر ئەحمەد باسیرە ، بە ڕوداوێکی دڵتەزێن لە مانگی ١/ ٢٠١٤ بۆ هەمیشە ماڵئاوایی لێکردین

# ناوەرۆك

# ناوەکان و کورتکراوەکان

Christ Demokratische Union : CDU (حیزبی یەکێتی دیموکراتی مەسیحی).

Christliche-Soziale Union in Bayern : CSU (حیزبی یەکێتی کۆمەڵایەتی مەسیحی لە بایەرن).

Sozialdemokratische Partei Deutschlands : SPD (حیزبی سۆشیال دیموکراتی ئەڵمانیا).

BÜNDNIS 90/ DIE GRÜNEN (بوندنیس ٩٠/ دی گرونن، هاوپەیمانی ٩٠/ سەوزەکان).

BUNDESTAG بوندستاگ (پەڕلەمانی ئیتحادی ئەڵمانیا).

BUNDESRAT بوندسرات (ئەنجومەنی فیدرالی/ هەرێمەکان).

DIE LINKE دی لینکە ( حیزبی چەپ).

KPD (حیزبی شیۆعی ئەلمانی).

SED حیزبی یەکێتی سۆشیالیستی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات

# پێشەکی

حیزبی سیاسی وەك ڕێکخراوێکی سیاسی / کۆمەڵایەتی یەکێکە لەو بابەتە گرنگانەی لە بواری زانستی سیاسی و کۆمەڵناسی سیاسیشدا مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ و ڕەهەندی سیاسی و یاسایی و کۆمەڵایەتی هەیە. حیزب لە پێناو گەیشتن بە دەسەلات خەبات دەکات و پردی پەیوەندیشە لە نێوان دەسەلات و کۆمەڵ. حیزب هەرگیز ناتوانێ بۆ سەرجەم گەل بدوێ و نوێنەرایەتی سەرجەم چین و توێژە کۆمەڵایەتیەکان بکات ، بەپێی پێناسەی زانستە سیاسیەکان تەنیا دەتوانێ نوێنەرایەتی بەشێکی کۆمەڵگا بکات ، بۆنمونە حیزبێکی کرێکاریی نوێنەرایەتی چینێکی سەرمایەدار ناکات. حیزب پێویستە بەرنامەی هەبێت: سیاسی ، ئابوری و کۆمەڵایەتی. حیزب ئەمڕۆکە تائیفەیەکی داخراو نەماوە کە ئەندامەکانی نەتوانن جێی نەهێڵن. مرۆڤ ئەو حیزبە هەڵدەبژێرێ لەگەڵ فکرو بەرژەوەندیەکانیدا گونجاون (بەرژەوەندیە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان) چونکە ئەم وای دەبینێ ئەوە بەرژەوەندی گشتی بۆ کۆمەڵگا جێبەجێ دەکات. دیموکراسیەتی هاوچەرخ بێ حیزبی سیاسی مەحاڵە. ئەو کۆمەڵگایانەی لەژێر سایەی سیستەمی دیموکراسی گوزەر دەکەن حیزبی سیاسی تێیدا لە سەرجەم پرۆسە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکاندا ڕۆڵی گرنگ و فراوان دەگێڕێ. هەڵبژاردنی حیزب لە سیستەمی دیموکراتیدا فاکتەرێکی گرنگە

بۆ ئەوەی حیزب نەبێتە دیکتاتۆر. حیزب ئۆرگانێکی گرنگە بۆ بەمۆدێرن کردنی یان پاش خستنی سیستەمی سیاسی. لەبەر ئەوەی سیستەمی سیاسی تاڕادەیەك بریتیە لە سیستەمی کۆمەڵایەتی هەربۆیە هەر جۆرە ناسەرکەوتنێك لە سیستەمی سیاسیدا دەبێتە هۆی دواکەوتنی سیستەمی کۆمەڵایەتی. هەربۆیە لەم بوارەدا گرنگیی بە ڕۆڵی حیزب و ڕێکخراوی سیاسی پێویستە بەتایبەت گرنگیدان بە ئایدۆلۆژیای ئەو حیزبە. هەروەها شوێن و زەمەن ڕۆڵی گرنگ دەبینێت لە دروستبوون و سروشتی سیاسی و فکریی حیزبدا. لە هاتنە خوارەوەی ژمارەی ئەندامان و کەمبوونەوەی بەشداریی هەڵبژاردن و لە دەرکەوتنی دیاردە نوێکاندا پرسیاری پێویستبوون بە ڕێفۆرم کردنی حیزب دێتە گۆڕێ. لەم توێژینەوەیەدا جگە لە پێناسەو باسی تیۆری حیزب و ئۆپۆزیسۆن بە گرنگم زانی بایەخیش بدەم بە پێگەی حیزب لەسەر سیستەمی سیاسی ئەڵمانیاو هەرێمەکانی و ڕۆڵی حیزب لە ناو ئەنجومەنی فیدرالیدا بۆ سوود وەرگرتن لێی نەك تەنیا لە لایەنی زانیاریەوە بەڵکو لە وەرگرتنی فکرو ئایدیاو بەراوردکاریش لێی ، هەروەها بۆ تێگەیشتن لە پێگەو ڕۆل و کاریگەریی حیزب لەسەر سیستەمی سیاسی لە ولاتێکی دیموکراتی و پێشکەوتودا.

dr.salarbasira@hotmail.com

# بەشی یەکەم

## حیزب ، پێناسەو چەمك و مێژووی سەرهەڵدانی

"حیزب لە واتا کۆن و زمانەوانیەکەیدا نیشاندەری دەستە بەندی و کۆبوونەوەی کەسانێکە کە ئامانج یان بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیەو لە دژی ئەوانە خەبات دەکەن کە ئەم ئامانج و بەرژەوەندیانەیان دەخنە مەترسیەوە"[١].

لێرەدا دەگەینە ئەو باوەڕەی حیزبێك هەرگیز ناتوانیٚ بۆ سەرجەم چین و توێژە کۆمەڵایەتیەکان بدویٚ چونکە بەپێی پێناسە تەنیا دەتوانیٚ نوێنەرایەتی بەشێکی بکات ، زۆربەی کات دژ بە بەرژەوەندیەکانی بەشەکانی تری کۆمەڵ. بۆنمونە حیزبێکی کرێکاریی خەبات ناکات لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی چینێکی سەرمایەدار بەڵکو بە پێچەوانەوە لە دژی دەوەستێتەوە.

"ئەسلی وشەی حیزب لە لاتینیەوە هاتوە (pars) کە لەزماندا بەش یان کەرت دەگەیەنێت"[٢]. واتە کۆمەڵێك خەڵك لەخۆ دەگرێت و بەشێکە لە کۆمەڵگا. مۆریس دۆڤریجە لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (حیزبە سیاسیەکان) "حیزبەکان

[١]) د. حوجەتولای ئەیوبی ، سەرهەڵدان و بەردەوامی حیزبە سیاسیەکان لە ڕۆژئاوادا ، وەرگێڕانی: ئازاد وەلەد بەگی ، چاپی یەکەم ، هەولێر ، ٢٠٠٧ ، ل. ٢٦.

[٢]) د.شعبان الطاهر الاسود ، کۆمەلناسی سیاسی ، وەرگێڕانی بۆ کوردی لەلایەن کۆلێژی زانستە ڕامیاریەکان ، سلێمانی ، ٢٠٠٦/ ل.١٣٥.

بە ڕێکخراوێك دەزانێ کە مەبەستیان بە دەستهێنانی دەسەلاتەو ئەندامانی هەولێ دەدەن ڕێبەرانیان پۆستە حکومیەکان بە دەستەوە بگرن"[٣].

حیزبی سیاسی بریتیە لە ڕێکخستن کە کۆمەڵێك تاك دەگرێتە خۆی کە بۆچونێکی فیکری هاوبەش کۆیان دەکاتەوە کە بڕوایان بە ئامانجی سیاسی و ئایدۆلۆجی هاوبەش هەیەو کار بۆ سازدانی ڕای گشتی دەکات بۆ بەرژەوەندی خۆی و بەدیهێنانی بەرنامەکانی و لەپێناو گەیشتن بە دەسەلات کە کردویەتیە ئامانجی سەرەکی خۆی. لە پێناوی ئەم ئامانجەدا حیزب گەورەترین ژمارە لە تاکەکان لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە لە ڕێگای ئامرازەکانی پڕۆپاگاندەوە. ئەمەش بۆ ئەوەی پشتگیری بۆ پڕۆگرامە تایبەتیەکەی دەستەبەر بکات بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی کە ئاماژەی پێدرا. حیزب بۆ سەرکردایەتیەك مل کەچ دەکات. سەرکردایەتی حیزب ، یان لەلایەن ئەندامەکانی حیزبەوە هەڵبژێردراوە، یان بەسەر حیزبدا سەپێندراوە لەبەر ئیعتباری سیاسی ، ئابوری ، یان کۆمەڵایەتی. کەواتە حیزبی سیاسی کە خاوەن سەرکردایەتیە هەمیشە هەولێ دەدات دەست بەسەر هێزی سیاسیدا بگرێت و بۆ ئەم مەبەستەش پشتگیری میللی پێویستە[٤].

بۆ تاکی کۆمەلێ شتێکی گرانە ئایدیاکانی بەتەنیا خۆی پڕاکتیزە بکات. لەبەر ئەوە بۆ هاوبیرەکانی خۆی دەگەڕێت ، ئەوانەی وەك ئەم بەدوای هەمان

---

[٣]) د. حوجەتولای ئەیوبی ، ل. ٢٩.

[٤]) محمود خیری عیسی ، النضم السیاسیه المقارنه ، مکتبه الانجلو ، القاهیره ، ١٩٨٥ ، ص. ٥٢.

ئامانجدا دەگەڕێن. مرۆڤ ئەو حیزبە هەڵدەبژێرێ کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیدا گونجاون (بەرژەوەندیە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان). ئەگەر مرۆڤ بیەوێ لە بواری سیاسەتدا چالاك بێت پەیوەندی بەو ڕێکخراوە یان حیزبەوە دەکات یان نزیك دەبێتەوە لێی کە نزیکترە لە ئامانجەکانی ئەمەوە چونکە ئەم وای دەبینێ ئەوە بەرژەوەندی گشتی بۆ کۆمەڵگا جێبەجێ دەکات[٥]. کەواتە حیزبی سیاسی بریتیە لە ڕێکخستنێك ، لە کۆمەڵە کەسێك پێك دێت کە پەیوەستیەکی مەعنەوی و فکری و مادی هاوبەش بەیەکیانەوە دەبەستێت و کار دەکات بۆ گەیشتن بە دەسەلات بەهەر میکانیزمێك بێت هەتا بتوانێت بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیان بەجێبهێنن و جێبەجێکردنی ئەوەی ئەوان بڕوایان پێیەتی[٦].

بە بیروڕای د. شعبان الطاهر الاسود: "حیزبی سیاسی یەکەیەکی ئاڵۆزەو ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی و سیاسیە کە ئۆرگانیزمێکی کارگێڕی تەواو ، و دەستەی کارمەندی هەمیشەی هەیە ، هەروەك چۆن لایەنگری جۆراوجۆری هەیە لە نێوان *تاکەکانی گەلدا کە سەر بە ژینگەو کەلتوری جیاوازن و داب و نەریتی جیاوازیان هەیە. ڕەنگە جیاوازی لە نێوان تاکەکانی گەلدا ئەوە پاڵی پێوە نابن کە ئینتیمایان بۆ حیزبێکی سیاسی* هەبێت"[٧] جیاواز لە یەکتر لە

[٥]) محمد السویدی ، علم الاجتماع السیاسی ، بغداد ، ١٩٩٥ ، ص. ٨٩.

[٦]) د. شعبان الطاهر الاسود ، علم الاجتماع السیاسی ، بغداد ، ١٩٩٢ ، ص ، ١١٢.

[٧]) هەمان سەرچاوە ، ل. ١١٢.

ڕووی فکری و سیاسیەوە. کەسێك بڕوایەکی قوڵی بە ئیسلامی سیاسی هەبێت نابێتە ئەندام یان دۆستی حیزبێکی کۆمۆنیست ، هەروەها بە پێچەوانەشەوە. حیزب ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی و سیاسیشە کە بۆنمونە لە کاتی هەڵبژاردندا ناکۆکی یەکتر دەکەن بۆ گەیشتن بەدەسەلات یان وەرگرتنی بەش لە دەسەلاتدا. حیزب پێویستە بەرنامەی هەبێت: سیاسی ، ئابوری و کۆمەڵایەتی. حیزب ڕێکخستنەو بنکەی کۆمەڵایەتی خۆی هەیەو پرۆسەیەکی سیاسی و فکریی ئالۆزە. جەماوەری حیزب وەك جاران نەماوەو سنوری جوگرافی بڕیوە. حیزب ئەمڕۆکە تائیفەیەکی داخراو نەماوە ئەندامەکانی نەتوانن جێی نەهێڵن. ئایا حیزب پێویستی بە بەرنامەی ئابوری و هێلی ئایدۆلۆجی هەیە؟ بۆ ئەم مەبەستەو تێگەیشتن و بەراورد کردن پێویستە بەرنامەی حیزب ڕوون و دیار بێت[٨]. لەبەر ڕۆشنایی باسەکە ناکرێ ئاماژە بە فاکتەری ئایدۆلۆژیا نەدرێ کە لەگەڵ حیزبی سیاسیدا هاوەڵ بووە.

دەوڵەتە مۆدێرنەکان لە سەرەتادا شێوازی حکومەتی پەرلەمانییان پێکهێنا. حکومەت پابەندبوو بە نوێنەرانی زۆرایەتی لە پەرلەماندا ، بەڵام ئەم پرۆسەیە گونجاو نەبوو بێ دروستبون و گەشەکردنی حیزب لەناو پەرلەماندا. حیزبە سەرمایەدارەکانی ئەو کاتە (کۆنزەرڤاتیف و لیبەرالەکان) لەناو پەرلەماندا دروستبوون. بەڵام سەرەتا لە دەرەوەی پەرلەمان حیزب دروستبوو ئەوانەی

[8]) Klaus von Beyme und andere, Band 2, Politikwissenschaft, Berlin, 1987, S. 118.

خۆیان وەك حیزبی پرۆتێستۆ دەبینی و وێنایەکی تریان هەبوو سەبارەت بەکۆمەڵگای دیموکرات. لەژێر فشاری حیزبە سۆسیالیستەکان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە جگە لە پرۆسەی بە پەرلەمان کردن، دیموکراتیزە کردنیش بەرەو پرۆسەی پێشچوون برا. دیموکراتیزە کردنی پەرلەمان رۆڵ و ئەرکی تری گرنگی گواستەوە بۆ حیزب. حیزب چیتر بەتەنیا یانەیەکی داخراوی هاولاتیانی ناوداری ناو پەرلەمان نەما. چیتر دەبوایە جەماوەری نوێی هەڵبژاردن قبولێ بکەن. ناچاری ئەوەبوون رێکخراوی سەرانسەریی ولات دروستبکرێ[٩]. " لە سەرەتادا تەنها دەستەیەکی دیاریکراو ماف هەڵبژاردنیان هەبوو ، ئەوانەش خاوەن موڵك و پیشەبوون کە بەگوێرەی یاسا باجیان ئەدا لەو ولاتانەی هەڵبژاردنیان وەك میکانیزمێك بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرایەتی و حکومەت بەکاردەهێنا ، واتە لەسەرەتادا ماف دەنگدان و هەڵبژاردن پەیوەستبوو بەبڕێکی دیاریکراوی پارەوە. ئەوەش پیاوانی دەگرتەوە بێ ژنان ، تا لە سەرەتای سەدەی بیست ئەم مافە گشتێندراو ژنانیشی گرتەوە"[١٠]. هەندێ لەو ولاتانەی کە حکومەتی پەرلەمانییان لە سەدەی نۆزدە دروستکرد بۆنمونە لە بەریتانیاو بەلجیکاو ئیتالیا ، بەڵام ماف هەڵبژاردنی گشتییان وەك کەمترین ماف دیموکراسی لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بەخشی بەسەرجەم هاولاتیان[١١].

حیزبی سیاسی لای یۆنانیەکان بە یەکەمین جۆری رێکخستنی سیاسی دێت لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا. شێوازو پێکهاتەی حیزبی سیاسی هەمان پێکهاتەو

---

[9] ) Klaus von Beyme und andere, S. 118-119.

[١٠]) کۆمەڵێك نوسەر ، حیزبی سیاسی ، و. ئارام ئەمین شوانی ، هەولێر ، ٢٠١١، ل. ٣٢.

[11]) Klaus von Beyme und andere, S. 118-119.

ڕێکخستنی ئێستای نەبوە بەڵام بنەما سەرەکیەکانی بەرژەوەندی چینایەتی و ئابوری هەبوە. بە سوودە ئاماژە بە مێژوی حیزبی سیاسی ڕۆمانەکانیش بدرێت چونکە ئەوانیش بەو پێیەی لانکەی یاساو شارستانێن و مێژویەکی درێژیان لە هەموو بوارەکانی زانستی مرۆڤایەتیدا هەبوەو لەوێش لە کۆنەوە حیزبی سیاسی هەبوە. ڕۆمانەکانیش حیزبی سیاسیان ناسیوەو هەر لەوێدا حیزبی خانەدانەکان هەبوە. حیزبی بازاڕیەکانیش هەبووە کە یەکەمیان نوێنەری پیرانی دەکردو دوەمیشیان نوێنەری چینە هەژارەکان بوو ، هەروەها ڕۆماش دوو حیزبی دیکەی دەناسی کە ئەوانیش حیزبی (دیموکراتی و کۆماری بوون)[١٢]. بەڵام تا ساڵی ١٨٥٠ جگە لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هیچ ولاتێك حیزبی سیاسی نەزانیوە بەواتای هاوچەرخی ئەم وشەیە. لێرەدا مەبەستمان حیزبی سیاسیە بەواتا هاوچەرخەکەی نەك بەواتای گروپی ئاینی و گروپی کۆمەلایەتی یان کۆمەڵبوونی مرۆیی کە ئامانجی بنەڕەتییان پێشکەش کردنی بەرنامەی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت نیە بەڵام هەول دەدەن بە دەسەلات بگەن[١٣]. "لە کۆندا جیاوازی هەبوە لە بیروڕادا ، یانەی میللی هەبوو، گروپە فکریەکان و پەرلەمانیەکان هەبوون بەڵام ئەمانە بەواتا ڕاستیەکەی هیچیان حیزبی سیاسی نەبوون"[١٤].

سەرجەم هۆکارەکانی پەرەسەندن و سەرهەڵدانی حیزب بەگشتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم خالانەی خوارەوە:

[١٢]) د. طارق علی الهاشمی ، الاحزاب السياسيه ، وزاره التعليم العالی و البحث العلمی ، جامعه بغداد ، ٢٠٠٠ ، ص. ١٢ ، ١٥.

[١٣]) کۆمەڵێك نوسەر ، ل. ٣٢.

[١٤]) بەهادین ئەحمەد موحەممەد ، پارتە ڕامیاریەکان ، سلێمانی ، ٢٠٠٧، ل.١٠.

1) چاکسازی ئاینی.

2) شۆڕشی پیشەسازی. شۆڕشی پیشەسازیش ئەم کاریگەریانەی دروستکرد:

- چینی ناوەندیی کۆمەڵ ژمارەو هێزیان زۆربوو.
- زۆربوونی سامانی سەرمایەداری.
- بەرپابوونی کۆچی جوتیاران لە لادێوە بۆ شار.
- زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان.
- گەورەبوون و زۆربوونی شارە گەورەکان.
- ئاسانبوونی هاتوچۆو پەرەسەندنی هۆکارەکان.
- گەشە سەندنی چینی کرێکار.
- زۆربوونی دەسەلاتی سەرمایەدار.
- شۆڕشی فەرەنسا.
- پەیدا بوونی بیری سۆشیالیزم.[١٥]

"دابەشبوونە کۆمەڵایەتیەکانی ناو کۆمەڵگە ئەوروپیەکان دەرئەنجامی دوو شۆڕشی گەورە بوون ئەوانیش بریتین لە شۆڕشی نەتەوەیی و شۆڕشی پیشەسازی. شۆڕشی نەتەوەیی کە ڕاستەوخۆ پاش ڕیفۆرمی ئاینی لە

[١٥]) دلێر مستەفا حەسەن ، ڕۆلی حیزبە سیاسیەکان لە بەرەوپێش بردنی کۆمەڵی کوردیدا ، توێژینەوەی زانکۆی سلێمانی ، کۆلێژی زانستە ڕامیاریەکان ، سلێمانی ، ٢٠٠٨ ، ل. ١٥.

دوادواییەکانی سەدەی شازدە سەریهەڵدا ، سەرەڕای زەمینە خۆشکردنی بۆ دروستبوونی دەوڵەتە نەتەوەییەکان لە ئەوروپا کۆتایی بە دەسەلاتی ڕەهای کەنیسەی کاسۆلیکیش هێنا. ئەم شۆڕشە دواجار دوو دابەشبوونی گەورەی لێکەوتەوە. یەکێکیان لە نێوان دەوڵەت و کلێسادا، ئەوی تریشیان لە نێوان کەمینە ئێتنی و ئاینیەکان و مەرکەزدا. شۆڕشی گەورەی دوەم شۆرشی پیشەسازی بوو لە سەدەی هەژدەهەمدا کە سەرچاوەی دوو دابەشبوونی تری ناو کۆمەڵگە ئەوروپیەکان بوو. دابەشبوونی یەکەمیان ئەو کەلێنە بوو کە کەوتە نێوان چینی کرێکاران و سەرمایەدارانەوە. دابەشبوونی دوەمیش کەوتە نێوان شارو گوندەوە. *لە ڕاستیدا ڕەگوڕیشەی بەشێکی زۆری حیزبەکانی ئێستای ئەوروپا دەچنەوە سەر ئەم دابەشبوونە.* دەوڵەتی نەتەوەیی پێویستیەکی زۆری بە حیزبی سیاسی هەبوو ئەویش لەبەر دوو هۆ: یەکەمیان بۆ ڕەوایی بەخشین بەم فۆرمە نوێیەی دەوڵەت چونکە پێشتر دەوڵەتی پاشایەتی لە میانەی (مافی خودا) بیەوەو بە پشت بەستن بە کلێسا ڕەوایەتی خۆی دەگەڕاندەوە بۆ مافێك کە لە ئاسمانەوە پێی بەخشراوە"[١٦] .

لە هەندێ لە ولاتانی ڕۆژئاوا لە سەدەکانی ١٨ و ١٩ دانیشتوان بۆچونیان وابوو دەسەلات سەرچاوەکەی لە گەلەوەیە ، جیهانبینیەك کە ململانێ و شۆڕشی بەرپا کرد بەرامبەر بە پاشاو مەلیکەکان چونکە ئەمەی دوایی وای بۆدەچوو دەسەلاتیان لەلایەن خوداوە پێدراوەو شەرعیەتی دەسەلاتەکەیان لەم لایەنەوە بۆ دروستبوەو دەستکاری ناکرێ[١٧] .

[١٦]) سایتی سبەی ، خەبات عبدالله ، دیدار ، ٩,٨,٢٠١١ .

[١٧]) د. سالار باسیرە ، دەسەلاتی سیاسی ، توێژینەوەی زانستی زانکۆی سلێمانی ، کۆلێژی زانستە ڕامیاریەکان ، سلێمانی ، ٢٠٠٨ ، ل. ١٧.

دەوڵەتی نەتەوەیی دەیویست ببێتە دامودەزگایەکی بێلایەنی کۆمەڵگەو بەڕێوەبردنی ململانێکانی شار لەڕێی دەستەوگروپ و حیزبە جیاجیاکان خۆیانەوە بێت. ئەگەر بڕوانینە حیزبی کوردی دەبینین لەسەر بنەمای دابەشبوونە کۆمەڵایەتیەکانی ناو کۆمەڵگە دانەمەزراوە ، هەروەکو لەسەر بنەمای ململانێکانی (شار) یش سەری هەڵنەداوە. شار بە مانا مۆدێرنەکە نیە چونکە پەیوەندی بەشێکی گەورەی هێزەکانی کۆمەڵگەی کوردیی تا ئێستا لەسەر بنەمای خوێن و ناوچەیە نەك لەسەر بنەمای پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکان. ئەگەر لە ڕۆژئاوا حیزب نوێنەری هێزێك یان چەند هیزێکی کۆمەڵگە بێت، ئەوا لای کۆمەڵگای کوردیی حیزب خۆی بە نوێنەری هەموو کۆمەڵگەو لە ڕاستیدا هەموو نەتەوە زانیوە. حیزبی کوردی چەند بچوکیش بوبێت خۆی بە نوێنەری هەمووان زانیوە. حیزبی کوردی مۆدێلی حیزبێکی جەماوەری گشتگیرو لە هەمان کاتدا مۆدێلێکی پارتیزان بووە ، ئەمەش بەو مانایەی لە سەرێکەوە گوزارشت نەبووە لە گروپێك یان چەند گروپێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو ، لە سەرێکی تریشەوە شەرعیەتی خۆی لە شۆڕشەوە وەرگرتوە. حیزبی کوردی هێندەی بە شوێن سەرکردەو ڕابەری کاریزماییەوە بووە ، ئەوەندە گوێی بە ئایدۆلۆژیاو جیهانبینی فکری و سیاسی نەداوە. بە پێچەوانەی خۆرئاواوە یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی سەرهەڵدانی ئەم فۆرمە لە حیزبایەتی پێش هەر شتێکی دیکە پرسی ڕزگاری نیشتیمانی و ڕوبەڕوبونەوەی داگیرکەر بووە. گومانیشی تێدا نیە لە غیابی دەوڵەتدا حیزبی کوردی هەمیشە وەکو دەوڵەتۆکەیەك ڕەفتاری کردوە[١٨].

---

[١٨]) گۆڤاری سڤیل ، خەبات عبداللە ، فیدراڵیزم وەکو ئەگەرێکی شکستخواردو ، ٢٠١٢ ، ژمارە ٣٤.

حیزبی سیاسیش ڕەنگدانەوەی واقعی کۆمەڵایەتی و فکری و ئابوری و کەلتوریی کۆمەڵگایە. حیزبیش بەشێکە لە سیستەمی سیاسی ، سیستەمی سیاسیش تاڕادەیەك بریتیە لە سیستەمی کۆمەڵایەتی هەربۆیە هەر جۆرە ناسەرکەوتنێك لە سیستەمی سیاسیدا دەبێتە هۆی دواکەوتنی سیستەمی کۆمەڵایەتی و حیزبیش لە گەڵیدا.

بۆ ئەوەی کۆمەڵێکی سیاسی ببێتە حیزبێکی سیاسی پێویستی بە پێنج مەرج هەیە:

١) بوونی ئایدۆلۆژیا.

٢) بوونی جەماوەر ، بەو ئیعتیبارەی کە جەماوەر بزوێنەرو دروستکەری مێژو و خەباتە.

٣) بوونی دەستەی پێشڕەو. ئەو پۆلە هوشیارە شۆڕشگێرە لێوەشاوەیەیە کە توانای پێشڕەوایەتی کردنی جەماوەرەکەی هەیە ڕوەو گۆڕینی واقیعەکەو گەیشتن بە ئامانجەکانی.

٤) بوونی فۆرمی ڕێکخستن ، بەمەبەستی گۆڕینی فۆرمە عەفەوی و زاتیەکەی کارکردن بە فۆرمی بابەتی و زانستی.

٥) پابەندیی (ئیلتیزام) کە بڕبڕە پشتی پێکهاتن و بونیادی حیزبەکەیە[19].

کاریگەریی حیزب لەسەر ئیرادەی سیاسی و بەدەستخستنی نوێنەرایەتی لە پەرلەماندا دەبێت گرنگیی خۆی هەبێت. لە دونیای مۆدێرندا سیمای گرنگی حیزب ئەوەیە ئامراز بێت نەك ئامانج. حیزب لە خزمەتی نیشتمان و کۆمەڵدا بێت و لە ڕێگای دامەزراوەکانی و بەرنامەکانیەوە بتوانێت ئەرکەکانی خۆی وەك دیموکراسیەت و بوارە نیشتیمانیەکان بە ئەنجام بگەیەنێت.

---

[19]) ئەحمەد صالح ، ڕێکخستن و ڕێکخستنی سیاسی ، سلێمانی ، ١٩٩٩ ، ل. ٢٤.

# بەشی دووەم
# حیزب لە سیستەمی سیاسیدا

## باسی یەکەم
## ڕۆڵی حیزب لە سیستەمی سیاسیدا




"ڕۆڵی حیزبی سیاسی گۆڕاوەو ناجێگیرە. حیزبی سەدەو دەیەکانی ڕابوردوو لە حیزبەکانی ئێستا ناچن. لە ڕابوردودا ڕۆلی حیزب کزو لاواز بوو ، ڕۆڵی هاولاتیانیش لەناو ژیانی سیاسیدا هەر لاواز بوو ، ئەوانەی دەسەلاتیان لەدەستبوو ژمارەیان کەمبوو ، بەڵام ڕۆڵی حیزب لەکۆمەڵگادا ڕۆڵێکی جەوهەریە"[20].

٢٠) کۆمەڵێك نوسەر ، ل. ٢٤.

## حیزب لە سیستەمی سیاسیدا[٢١] چوار ڕۆڵ دەبینێت

١) ڕۆڵی دۆزینەوەی ئامانج: حیزب ئایدۆلۆژیاو بەرنامەی هەیە. هەوڵی ستراتیجیەتی نیشاندەر ئەدات و خەڵکیی لە ئیمکانیەتی ئالتەرناتیڤ تێدەگەیەنێت.

٢) ڕۆلی پێکەوە بەستنی بەرژەوەندیە کۆمەڵایەتیەکان دەبینێت. ڕێکخراوە مەدەنیەکانیش هەمان بەرژەوەندی و ئامانج گوزارشت دەکەن بەڵام بە تەنیا حیزب لە شێوەیەکدا کۆیان دەکاتەوە کە کاریگەریی لەسەر دروستکردنی ئۆرگانی ناوەندی دەوڵەت دروستدەکات.

٣) ڕۆڵی مۆبیلیزەکردن و گەشەپێدانی کۆمەڵ و بەکۆمەڵایەتی کردنی هاولاتیان. حیزب بەرێگای پەروەردەی سیاسی هەولی بەگەڕخستن و چالاکی سیاسی و بەشدار بوون ئەدات و هەڵوێستە سیاسیە سەرەکیە مەودا دورودرێژەکان دەڕەخسێنێت. بەڵام گرنگیی ئەم بوارە بەردەوام لە هاتنە خوارەوەدایەو بەشێکی لەلایەن میدیاوە دەگیرێتە دەست.

---

(٢١) سیستەمی سیاسی دەوڵەتێك بە دەستورو کەلتوری سیاسی و ئەلیتە سیاسیەکەیەوە دیاری دەکرێت ، هەروەها لە دابەشکردنی دەسەلاتە واقعیەکان لە نێوان ناوەندەکانی بڕیاردا. سیستەمە سیاسیەکان و دامەزراوەکانی وەك (پەڕلەمان، حکومەت ، دادوەری) ، دەوڵەت ، حیزب و ڕێکخراوەکانی و ڕای گشتی و هاوبەشیی هاولاتی لە حکومەت و کارگێڕیدا، هەروەها ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان ، دەسەلات و هێز و پێشبڕکێییەکانی هەڵبژاردن ، هەموو ئەمانە لەژێر چەتری سیستەمی سیاسیدا کۆدەبنەوە. سیستەمی سیاسی داینەمۆی دەوڵەت و ژیانی کۆمەڵگایە ، هەروەها ئەرکی ڕێکخستنی کۆمەڵ دەگرێتە ئەستۆ. سیستەمی سیاسی زیاتر تایبەتە بە ڕێکخستنی شێوازو کاری دەسەلات و کۆمەڵ و کۆمەڵە سیاسیەکان و چەند دامودەزگایەکە لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا کاروباری بەڕێوەبردن دەگرێتە ئەستۆ لە ڕێگای ئەو یاساو ڕیاسا مولزیمانەی لە ئارادان ، یان دانراوون لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیایەکی سیاسی پەیڕەوکراودا. بەڵام سیستەمی سیاسی بەتەنیا بریتی نیە لە دامەزراوە حکومیەکان بەڵکو لە هەموو پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکان بە هەموو لایەنە سیاسیەکانیەوە بە پێکهاتە تەقلیدیەکانیشەوە کە لەسەر بنەمای خزمایەتی و عەشیرەت دامەزراون. بەواتا سیستەمی سیاسی ئەو دیاردانەیە کە بەهەمویانەوە سیستەمێك پێك دێنن.

٤) ڕۆڵی پێکهێنانی حکومەت و نوخبە: ئەم ڕۆڵە ئەمڕۆکە گرنگیەکی ناوەندی هەیە. سیاسەت کە ئێستەش بەگشتی بەڕێگای کەسەوە دەکرێ زۆربەی جار بەر ڕەخنە کەوتوە.

حیزب دەبێت بەشێوەیەکی بەرپرسانە ڕێگای کاروچالاکی حکومی بگرێتەبەر. بەڵام هەموو حیزبێك وەك یەك واتوند نەبەستراوە بە سیستەمە سیاسیەکەوە کە خۆی پابەند ببینێت بە هەموو ئەو چوار ڕۆڵەی دەبێت بیبینێت[٢٢].




حیزب پێویستی بە میدیا هەیە ئەگەر بیەوێ بەرنامەکانی و بۆچونەکانی بە هاولاتیان بگەیەنێت. هەر بە ڕێگای میدیاوە دەتوانرێت بزانرێت چ شتێك هاولاتیان دەجولێنێت ، بۆچونیان چیە لەسەر هەڵبژاردنەکان و هەروەها هەڵوێستیان بەرامبەر بە دەسەلات. حیزب بە ڕێگای ڕێکخراوەکانی خۆیەوە هەول ئەدات پەیوەندی و کاریگەریی لەنێوان ئەم و کۆمەڵ دروستبکات. بەم شێوەیە سیستەمێکی کاریگەریی لەسەر یەکتر وە نێوان یەکتر هەیە.

22 )Klaus von Beyme und andere, S. 122.

## باسی دووەم

## حیزب لە سیستەمی دیموکراتیدا

دیموکراسیەتی هاوچەرخ بێ حیزبی سیاسی مەحالە. "ئەو کۆمەڵگایانەی لەژێر سایەی سیستەمی دیموکراسی گوزەر دەکەن حیزبی سیاسی تێیدا لەسەرجەم پرۆسە سیاسی و کۆمەلایەتیەکاندا ڕۆڵی گرنگ و فراوان دەگێڕێ"[٢٣]. هەڵبژاردنی حیزب لە سیستەمی دیموکراتیدا فاکتەرێکی گرنگە بۆ ئەوەی حیزب نەبێتە دیکتاتۆر. بەڕێگای هەڵبژاردنی ئازادەوە ناچاربێت چارەنوسە سیاسیەکەی بەندبێت بەو دەنگانەوە کە خەڵکی ولاتەکە ئەیدەنێ. هەربۆیە ئەم دیاردەیە وادەکات حیزبەکان هەمیشە لەژێر ململانێی یەکتردابن بۆ پێشکەشکردنی بەرنامەی باشتر. حیزب دەکرێ سیاسەت بۆ کۆمەلانی خەڵك پێشنیاز بکات ، بەلام ناتوانێت بڕیاری بۆ بدات. حیزبێك کە سەرجەم سیاسەت بۆ سەرجەم هاولاتیان بڕیار بدات ئەوا بەتەواوی دژە دیموکراتە. لەگەڵ ئەوەشدا چەند ڕەخنەیەك هەن لە دیموکراتی مۆدێرندا ڕوبەڕوی حیزب بونەتەوە کە بریتین لە:

١) زۆر بەهێز بوون و بوونەتە حیزبی بیرۆکراتی.

٢) پەیوەندییان بەگەلەوە ونکردوەو لە ڕووی بەرنامەوە بونەتە حیزبی جەماوەریی بێدەموچاو ، و ڕەنگ و ڕوو.

٣) لەسەر ئاستی پەرلەمان و حکومەت ڕەخنە لە دەسەلاتە زۆرەکەیان دەگیرێت.

---

٢٣) کۆمەڵێك نوسەر ، ل.٦٠.

٤) بێدەسەلاتی و بێتواناییيان سەبارەت بە یەکخستنی کۆمەڵایەتی دانیشتوان بەر ڕەخنەی توند دەکەوێ.

توێژینەوەی زانستی سیاسی لێرەدا بەم سەرنجانەوە ناوەستێ ، دەبێت هەوڵ بدات حیزبەکان لە کێڵگەی کارو چالاکیاندا لێك بکاتەوە بۆ ئەوەی بگاتە ئەو ئەنجامەی کام لەم خاڵی ڕەخنانە ڕەوان[٢٤] .

## باسی سێیەم

## جۆرەکانی حیزب

حیزبی سیاسی لە ڕووی بەرنامەو فکری سیاسیەوە هاوشێوە نین. مۆریس دۆفریجە جگە لەوەی باس لە شوێن و زەمەن و فکر دەکات بۆ دروستبونی حیزبی سیاسی ، چیتر حیزبە سیاسیەکان بەسەر چوار شێوەدا دابەش دەکات:

- حیزبە شیۆعیەکان.
- حیزبە سۆشیالیستەکان.
- حیزبە فاشیەکان.
- حیزبی پارێزگاران[٢٥] .

لێرەدا بەگشتی ئاماژە بە هەندێ لە شێوەی حیزبە سیاسیەکان ئەدەم:

- حیزبی دیموکرات.
- کۆنزەرڤاتیڤ.
- لیبرال.
- حیزبی حکومەت.

24) Klaus von Beyme und andere, S. 120.

٢٥) دیڤد بینهام/ کوین بویل ، و. ئەبوبەکر خۆشناو ، ئازادی دیموکراسی و کۆمەڵی مەدەنی ، سلێمانی ، ١٩٩٩، ل. ٢٢.

- حیزبی هەڵبژاردن (تەنیا پێش هەڵبژاردن چالاکە).
- حیزبی جەماوەریی ، حیزبی بەرژەوەندی.
- حیزبی سەرکردە (قائد) / (تەنیا کەسێك رێگاو ئامانجە سیاسیەکان دیاری دەکات و خۆی بە چەقی دەسەلات دادەنێت و هەمیشە بە ئاڕاستەی تاك حیزبیدا دەڕوات).
- حیزبی بلۆك ، وەك ئەوەی لە ئەڵمانیای ڕۆژهەلات هەبوو ، ڕۆلی لەوەدابوو جەماوەرێکی بەرفراوان بخزێنێتە نێو دەسەلاتە فەرمانڕەوایەکەو بەم شێوەیە دەسەلاتە سیاسیەکە سەلامەت بکات.
- ئەو حیزبانەی لەناو پەڕلەمان دروستدەبن: ئەم حیزبانە بەرێگای پێکەوە یەکگرتنی پەڕلەمەنتاری جیاوازەوە دروستدەبێت کە بەرژەوەندیەکانیان یان ئایدۆلۆژیایان زۆر پێکەوە گونجاوە.
- ئەو حیزبانەی لە دەرەوەی پەڕلەمان دروستدەبن: وەك شێوازی نوێی حیزبێك وەسف دەکرێن. لە ڕووی مێژووەوە بۆی بڕوانین ئەو حیزبانەی لە دەرەوەی پەڕلەمان دروستبوون زۆربەی کات وەك لایەنی چەپ حیسابیان بۆ دەکرێت[٢٦].

دوکتۆر طارق علی الربیعی لەکتێبەکەیدا (الاحزاب السیاسیە) باس لە نوسەر بریلو فیرجع دەکات و ئاماژە بە پێنج جۆر لە حیزب ئەدات کە بریتین لە:

- حیزبە عەقائیدیەکان.
- حیزبە شەخسیەکان.
- حیزبە مێژوییەکان.
- حیزبەکانی ئاڕاستە.
- حیزبەکانی بەرژەوەندی[٢٧].

---

26) www.lerntippsammlung.de/Entwicklung-des-deutschen-Parteiensystems-nach-1945.html -

٢٧) طارق علي الربيعي ، الاحزاب السياسية ، بغداد ، سال نادیارە ، ل. ١٤٦.

لە ئایدۆلۆژیا سیاسیە گرنگەکان کە لە ئەوروپا لە سەدەی نۆزدە لە ئەنجامی شۆڕشی فەرەنسی و سەرهەڵدانی مەسەلە کۆمەلایەتیەکان گەشەیان کردو هەتا ئەمڕۆش ئاڕاستە سیاسی و فکریە سەرەکیەکانی پێکهێناوە بریتین لە لیبەرالیزم ، کۆنزەرڤاتیزم ، سۆسیالیزم / کۆمۆنیزم. ئایدۆلۆژیای تری سیاسی گرنگ وەك ناسیۆنالیزم ، فاشیزم و ناسیۆنال سۆسیالیزم[٢٨]. لە ڕیزبەندی حیزبدا هەمیشە خۆمان لەناو دوو جۆر سیستەمدا دەبینینەوە کە بریتین لە حیزب لە ناو سیستەمی دیموکراسی و سیستەمی دیکتاتۆری و تۆتالیتێردا.

## باسی چوارەم

## حیزب و هەڵبژاردن

حیزب دەیەوێ هەڵبژاردن بباتەوە ، بەڵام کاری حیزب لە هەڵبژاردندا لەوە دروست نەبوە تەنیا دروشم بۆخۆی بدۆزیتەوە وەك (ئاشتی بۆ هەمووان ، بۆ ئازادی و چاکسازی ، سەرۆك دێت...). شەڕی هەڵبژاردن لانی کەم لە پێنج قۆناغ پێکهاتووە:

١) گەشەدان بە بەرنامە.

٢) پێشکەش کردنی کاندید.

٣) دیاریکردنی بابەتە سیاسیەکان.

٤) مۆبیلیزە کردنی دۆست و جەماوەر.

٥) بردنەوەی هەڵبژێردەر[٢٩].

28) de.wikipedia.org/wiki/Politische_IdeologieIm Cache - Ähnliche Seiten.
29)www.bpb.de/.../LIS62C,0,Parteiensystem_der_Bundesrepublik_Deutschland. html-

حیزب لە ژیانی دیموكراسیدا هەڵبژاردن ڕێكدەخات و بەشداریی تێدا دەكات بۆ ئەوەی دەنگ بهێنێت ، هەربۆیە حیزبی سیاسی دەبێت دەزگایەكی ژیانی دەستوری بێت. حیزب لە كاتێكدا هەوڵی بەدەستهێنانی دەنگ و دەسەلات ئەدات ، هەر بۆیە گرنگیشە كە بیروڕای سیاسی گەلیش بخوێنێتەوەو هەروەها بوارو بنەماكانی ژیانی سیاسی ڕوون بكرێنەوەو هەڵوێست دەربارەیان وەربگیرێن بەشێوەیەك كە لەكاتی هەڵبژاردنی گشتیدا توانای بڕیاری سیاسی ڕوون و تەواو بۆ گەل بخولْقێندرێت. هەربۆیە مرۆڤ دەكرێ حیزب وەك ڕێكخراوێكی خەبات پێناسە بكات كە بەڕێگای دەنگ هێنانەوە دەیەوێ ئەوەندە دەسەلاتی بێتە دەست كە بەهۆیەوە بتوانێ ئامانجەكانی بەدی بهێنێت[30]. بێگومان لێرەدا باس لە حیزب دەكرێت لە سیستەمی سیاسیدا كە هەڵبژاردنی ئازادی تێدا هەبێت و بنەما دیموكراسیەكان بوونی هەبێت. حیزب كە لە هەڵبژاردندا دەنگەكانی بردەوە ئەو كاتە لە ناو پەرلەماندا بەپێی دەستور حكومەت پێكدەهێنێت. بەواتا حیزب حوكم دەكات بەڕێگای حكومەتەوە نەك حیزب خۆی ڕاستەوخۆ حوكم بكات وەك لە دەولەتی حیزبیدا هەیە. لێرەدا چیتر دەبێت یاسای حیزب هەبێت، حیزب و سەرۆكی حیزبیش لەبەردەم یاسادا یاسایی مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت. بودجەی حیزبیش بەپێی یاسا دیاری بكرێت. هەروەها خەرجی هەڵبژاردنەكانیش بەپێی یاسای حیزب دیاری بكرێت (یاسای تەندروست). هەموو پارەیەكی نامۆو ناشەرعی ئاڕاستەی هەڵبژاردن دەگۆڕێت و حیزب پابەند دەكات ، دیاردەیەك بە زیان دەگەڕێتەوە بۆ ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتیمانی.

---

30) Hans Ritscher, Welt der Politik, Berlin, 1975, S. 75.

هەلبژاردن مافە ، یەکێکە لە مافەکانی مرۆڤ و مافی هەلبژاردن پرۆسەیەکی دیموکراتی و مەدەنیەو دەکرێ ببێتە هۆی خولقانی ئالوگۆڕو دەستاودەست کردنی دەسەلات بە ڕێگای ئاشتیانە. هەربۆیە هەڵبژاردن ئالتەرناتیڤی جەنگ و توندوتیژیە. لێرەدا گرنگە دەنگدەر لەسەر بنەمای سۆز و وەلاو وەفا بۆ سەرکردەی کاریزما دەنگ نەدات بەڵکو لەسەر بنەمای ئەقلانیەت دەنگبدات ، ململانێ لەگەڵ فکرو ئایدۆلۆژیاو بەرنامە بکات چونکە عەدالەتی کۆمەڵایەتی و چارەنوسی کۆمەڵگاو سیستەمە سیاسیەکە بەندە بە دەنگ و فکرو بۆچوونی سیاسی دەنگدەرەوە. بێ هەڵبژاردنی ئازاد دیموکراسی جێگای بیرکردنەوە نیەو گرنگترین ئامرازی کاریگەرە بۆ کۆنترۆڵ کردنی دیموکراسیەت. لە هەڵبژاردندا گەل بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەسەلات دەگوێزێتەوە بۆ نوێنەرەکانی. ئەگەر دەنگدەران ڕەزامەند نەبن بە سیاسەتی فەرمانڕەوایان ئەوا ئەتوانن بە ڕێگای دەنگدانەوە گۆڕان لە دەسەلاتەکەدا بکەن.

**هەڵبژاردن تەنیا یەكێكە لە خەسڵەتەكانی دیموكراسی، بەواتا دیموكراسیەت هەمووی بە پرۆسەی هەڵبژاردن پێوانە ناكرێت. دیموكراسیەتی تەواو و ڕاستەقینە لە هەڵبژاردنی ئازاددایە ، لە بوونی دەستور (دەستوری تەندروست)، جوداکردنەوەی سێ دەسەلاتەکە لە یەکتر (یاسادانان و جێبەجێ كردن و دادوەری) ، ئازادی تاك وەك یەكێك لە خەسڵەتەكانی كۆمەڵگای مەدەنی ، ئازادی فكرو نوسین و بوونی ڕێكخراوەكان ، هەروەها لە مافەكانی مرۆڤ و مافی هاولاتی بووندایە...**

هەڵبژاردنی حیزب لە سیستەمی دیموکراتیدا فاکتەرێکی گرنگە بۆ ئەوەی حیزب نەبێتە دیکتاتۆر. بەڕێگای هەڵبژاردنەوە چارەنوسە سیاسیەکەی بەندبێت بەو

دەنگانەوە کە خەڵکی ولاتەکە ئەیدەنێ. ئەم شتە وادەکات حیزبەکان هەمیشە لەژێر ململانێی یەکتردابن بۆ پێشکەشکردنی بەرنامەی باشتر. حیزب دەکرێ سیاسەت بۆ کۆمەلانی خەڵك پێشنیاز بکات بەڵام ناتوانێت بڕیاری بۆ بدات. حیزبێك کە سەرجەم سیاسەت بۆ سەرجەم هاولاتیان بڕیار بدات و بیسەپێنێت بەسەریدا ئەوا بەتەواوی دژە دیموکراتە ، چونکە حیزب دەبێت بە ڕێگای یاساو حکومەتەوە حوکم بکات و بەرنامەکانی خۆی بۆ گەل و دەولەت جێبەجێ بکات. لە کۆمەڵگا دواکەوتوەکاندا ، یان تازە پێگەیشتوەکاندا دیاردەی هەڵبژاردن کاریگەریی گەورەو گرنگی هەیە لە گەشەپێدانی پرۆسەی دیموکراسیدا بە تایبەتیش ئەو کۆمەڵگایانەی کە بەئاراستەی دیموکراسی هەنگاو دەنێن هەرچەندە لەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا بەهۆی هەیمەنەی حیزبە دەسەلاتدارەکانەوەو هەولی ئەوانە بۆ مانەوەیان لە دەسەلاتدا ، ئەوا پرۆسەی هەڵبژاردن کاریگەریی گەورەی لەسەر دەستاودەست کردنی دەسەلات و گۆڕانگاری لە نەخشەی سیاسی هێزەکاندا دروست نەکردوە. لە زۆرێك لە دەولەتان هەڵبژاردنی سیاسی ئەنجام ئەدرێت کە پێش مێژووی دیموکراسی نەبوە. لە هەڵبژاردندا دەکرێ پرۆسەی دیموکراسی و قەوارەی حیزبەکان پێوانە بکرێت. زۆرجاریش لایەنێك نایەوێت هەڵبژاردن هەبێت بەڵام بارودۆخەکە ناچاری دەکات هەربۆیە هەولی فرِوفێل ئەدات. هاولاتی لە پرۆسەی هەڵبژاردندا پیادەی یەکێك لە مافە سەرەتاییەکانی خۆی دەکات کە بریتیە لە هەڵبژاردنی ئەو حیزب و ڕێکخراوەی لەگەڵ فکرو بەرژەوەندیەکانی ئەمدا یەکدەگرێتەوە ، بەرژەوەندیە (سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان). هەربۆیە گرنگە دەنگدەر بزانێت دەنگ بە کام حیزب بەرنامەی ڕاستەقینەی ئەو لایەنە سیاسیە ئەدات کە جێگای جێبەجێ کردنبێت و بەرژەوەندی گشتی تێدا بێت. ئەوەش بێگومان

بەندە بە ڕادەی هوشیاری سیاسی و کۆمەڵایەتی هاولاتیان و دەنگدەرەوە.
**بێگومان هەر چین و توێژێکی کۆمەڵایەتی دەبێت لە ڕوانگەی بەرژەوەندیە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکانی خۆیەوە بڕوانێتە بەرنامەو پرۆسە سیاسیەکەو ململانێی لەگەڵدا بکات و بەراوردی پەیمان و بەرنامەی حیزبەکان بکات لەگەڵ یەکتردا. هەموو ئەمانە دەکرێ ببنە هۆی هوشیار کردنەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەنگدەر. هەربۆیە پرۆسەی هەڵبژاردن بریتی نیە تەنها لە پرۆسەیەکی سیاسی بەڵکو ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیشە.**
دەکرێ حیزبێك لە هەڵبژاردندا زۆرینەی دەنگەکان بەدەست بهێنێت بەم شێوەیە شەرعیەتی پێئەدرێ و دەکرێ بگاتە دەسەلات ، بەڵام مەرج نیە ئەو حیزبە دیموکرات بێت بەڵام شەرعیەتی پێدراوە. بەڵام ئەگەر خواستی دەسەلاتدار / حیزبی دەسەلاتدار لەگەڵ بۆچونەکانی کۆمەڵ سەبارەت بە شەرعیەت یەکنەگرێتەوە ئەوا ململانێ دروستدەبێت.

## باسی پێنجەم

## گرنگی حیزب لە بەمۆدێرن کردن یان پاش خستنی سیستەمی سیاسی

حیزب ئۆرگانێکی گرنگە بۆ بەمۆدێرن کردن یان پاشخستنی سیستەمی سیاسی. هەربۆیە لەم بوارەدا گرنگیدان بە ڕۆڵی حیزب و ڕێکخراوی سیاسی پێویستە بەتایبەت گرنگیدان بەئایدۆلۆژیای ئەو حیزبە. بەمۆدێرن کردن پێویستی بە هوشیاری کۆمەڵایەتی هەیە کە یارمەتی کۆمەڵ ئەدات بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانی بەمۆدێرن کردن و ڕێگا بۆ هاولاتیان خۆش دەکات لەزۆر لاوە چاودێری ژیان بکەن لە بواری سیاسی ، کۆمەڵایەتی ، کەسایەتی... تاد. بە مۆدێرن کردن بریتیە لە گواستنەوەی کۆمەڵگا لە قۆناغی تەقلیدیەوە بۆ

قۆناغێکی مۆدێرن وەك ئەوەی لە ئەوروپای سەدەی حەڤدەو هەژدە ڕوبدا لە بوارەکانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و فکری. ئەم جۆرە کۆمەڵگایە لەژێر کاریگەرێتی سێکۆلاریزم گەشە دەکات. لێرەدا مەبەست لە کۆمەڵگای هاوچەرخی دیموکراتیە کە پرەنسیپی ئیندیڤیدوالیزمیش (تاك گەرایی) تیایدا پارێزراو بێت وەك یەکێك لە پرەنسیپەکانی کۆمەڵگای مەدەنی.

کۆمەڵگا بەبێ دەسەلاتی سیاسی ڕێکخراو مەحاڵە ، پێویستی بە دەسەلات و سیستەمێکی سیاسی ڕێکخراو هەیە بۆئەوەی بنەماکانی ژیان و گوزەران ڕێك بخات. دەزگاکانی دەوڵەت کە سیستەمە سیاسیەکە پێکدەهێنن وەك پەرلەمان و حکومەت و دادوەری ڕۆڵی گرنگ دەبینن تێیدا. لێرەدا حیزبی سیاسیش گرنگ و پێویستە بۆ سیستەمی سیاسی کە بریتیە لە شێوازێك بۆ بەیەکەوە گرێدان و بەستنەوەی گشت پەیوەندیە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوریەکانی ناو کۆمەڵگا ، هەروەها ئەرکی ڕێکخستنی کۆمەڵ و ڕۆڵی بەرێوەبردن دەگرێتە ئەستۆ لەرێگای ئەو یاسایانەی هەن لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیایەکی سیاسی پەیرەوکراودا[٣١]. ڕێفۆرم کردنی سیستەمی سیاسی بەر لەهەر شتێك پێویستی بە ڕێفۆرم کردنی حیزب هەیە چونکە حیزب رۆڵی گرنگ دەبینێت بۆ بە مۆدێرن کردنی سیستەمی سیاسی.

(٣١) ڕێبین ڕەسول ئیسماعیل ، سیستەمی سیاسی ، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری ، شوێن نادیارە ، ٢٠٠٣ ، ل. ٥٥.

## باسی شەشەم

## دارایی و بودجەی حیزب

دەستکەوتە ماددیەکانی حیزب چوار سەرچاوەی سەرەکی دەگرێتەوە:

- ئابونەی ئەندامان کە ئابونەی تایبەتی ئەندام پەرلەمان و وەزیرەکانیش دەگریتەوە.
- پیتاك[٣٢].
- بودجەی حیزب لە لایەن دەوڵەت.
- هەروەها ئەو حیزبانەی بەشدارن لە پرۆژەی ئابوری بۆ خەرجی

زیاتری خۆیان. بەپێی ماددەی ٢١ی یاسای حیزبەکان لە ئەڵمانیا دەبێت حیزب سەرچاوەی داراییەکانی ئاشکرا بکات. دەستکەوتەکانی و خەرجیەکانی بەئاشکراو بەفەرمی بخاتەڕوو[٣٣]. بەڵام ئەوە ناگەیەنێت حیزب ببێتە خاوەن پرۆژەی گەورەی ئابوری و ببێتە سەرمایەداری گەورە.

سەرجەم حیزبە سیاسیەکان لەپرۆسەی هەڵبژاردندا پێویستیان بەدارایی هەیە ، بەڵام هیچ کام لەمانە ناتوانێت سەرجەم پێویستیە داراییەکەی خۆی و خەرجی پرۆپاگاندەی هەڵبژاردن و کاری حیزبیی تەنیا بەرێگای ئابونەی ئەندامەکانیەوە

---

32) de.wikipedia.org/wiki/Parteienfinanzierung.

33) Nils C. Bandelow, Einführung in das politische System der BRD , Berlin, 17.11.2008, S. 112..

دابین بکات. حیزب بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی پێویستی بەپارە هەیە. پارە بۆ کاروباری کارگێڕی (کرێ ، پێویستیی نوسینگەکانی ، خەرجی کارمەندانی ، هاتوچۆو چالاکیەکانی ، پێگەیاندنی ئەندامەکانی و کارو پێویستیی هەڵبژاردن و زۆریتر). بەڵام هاوکاریی پارەی نامۆ بۆ حیزبێکی سیاسی بەپێی ئەزمون بەندە بە مەرج و بەرژەوەندیەوە. بۆئەوەی هیچ حیزبێکی سیاسی پەنا بۆ دەوڵەتانی دەرەکی نەبات و بەهەر شێوەیەك بێت بکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو لایەنە ، چونکە ئەم دیاردەیە دەبێتە دروستکردنی مەترسی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی. لێرەدا پێویستە بودجەی حیزب بەپێی یاسایەکی تەندروست ڕێکبخرێت[٣٤] .

دارایی و خەرجی مەسەلەیەکی گرنگە بۆ ڕوناکی خستنە سەر پەیوەندیەکانی حیزب و دەسەلات. حیزب پێویستە سەرچاوەکانی دارایی و دەستکەوتەکانی دیاربن. سەربەخۆیی حیزب باشتر دەپارێزرێت ئەگەر سەرچاوەی دارایی ، مینحەو خەرجی حیزب لەلایەن دەوڵەتی یاساوە بێت وە بەشێوەیەکی یاسایی ڕێکخرابێت و بەپێی پێویست بدرێ چونکە ئابوری ولات ئابوری نەتەوەیە، هەربۆیە دەبێت لەلایەن حکومەتەوە دادپەروەرانە مامەلەی لەگەڵدا بکرێ. دەوڵەت بەم شێوەیە دەتوانێ کۆنترۆڵی دارایی حیزبەکان بکات و داوای دۆسیەی دارایی کراوەشیان لێبکات[٣٥] .

34) Christian Starck, Politische Parteien, Bonn, 1970, S. 42-43

٣٥) هەمان سەرچاوە ، ل. ٧٨.

# بەشی سێیەم
# سیستەمی تاك حیزب

## باسی یەکەم
## سیستەمی تاك حیزب ، بوونی یەك حیزبی سەرەکی

سیستەمی تاك حیزب بەواتای بوونی تەنیا یەك حیزبی سەرەکی و مۆنۆپۆلی دەسەلات و جموجۆلی ڕامیاری دەکات و هەموو ئیمتیازات بۆ خۆی قۆرخ دەکات. سیستەمی تاك یان یەك حیزب لە مێژە هەیە. بەواتا تاکڕەوی لە دەسەلاتدا زۆر کۆنە بەڵام لە شێوازی تاکڕەوی تاکە کەسیدا بوە نەك تاکە حیزب. دیاردەی یەك حیزب لە دەوڵەتدا لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە هاتۆتە کایەوە[٣٦]. لەم سیستەمەدا دەسەلاتی سیاسی لە دەستی تاکە حیزبێکدا کۆدەبێتەوەو لەسەر بنەمایەکی ئایدۆلۆژی دەوەستێت. بۆنمونە نازییەت ڕژێم و حیزبێکی ڕادیکالی دژە یەهود ، دژە کۆمۆنیزم و دژە دیموکرات و بزوتنەوەیەکی سیاسی فاشی تۆتالیتێر بوو کە نوێنەرایەتی ئەم ئایدۆلۆژیایەی دەکرد[٣٧]. ئۆرگانە کارگێڕی و سەرکردایەتیەکەی تاك حیزب دەبێتە دەسەلات لە دەوڵەتدا، واتا سەنتەرگرتنی هێز لەدەستی حیزبدا. لە تایبەتمەندیەکانی سیستەمی دیکتاتۆری ئەوەیە کە سیستەمێکی تاکە کەسیەو پەیوەستە بە کەسی دیکتاتۆرەوەو دیکتاتۆر خۆی دەسەلاتی بە دەستەوەیە.

---

[٣٦]) بەهادین ئەحمەد موحەممەد ، تیۆری دەوڵەت و سیستەمە ڕامیاریەکان ، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل. ٢٠٣.

37) Faschismus; Ursachen und Politik des deutschen Faschismus, Hamburg, 1979, S

تایبەتمەندیەکی دیکەی سیستەمی دیکتاتۆری هەبوونی یەك حیزبە لە ولاتدا بێگومان ئەو حیزبەش حیزبی دیکتاتۆرە. لە زانستی سیاسیدا باس لە دوو جۆر دیکتاتۆری دەکرێت ئەوانەش بریتین لە دیکتاتۆری تاکە کەسی کە دەوڵەت لەسەر ئیرادەی ئەو بەڕێوە دەڕوات هەروەها دیکتاتۆری ڕێچکەیی کە بەند نیە بە تاکە کەسێکەوە بەڵکو گرێدراوی چەمکێکە یان بیروبۆچونێك دەربارەی دەوڵەت و دەسەلاتی ڕامیاری و دەسەلات بەڕێوەبردن و گواستنەوەی دەسەلات لە دەستێکەوە بۆ دەستێکی تر دەبێت بەپێی پرانسیپ و لە چوارچێوەی ڕێچکەی دیاریکراودا بێت[38].

بەو پێیەی سیستەمی تاك حیزبی ڕوبەڕوی کێشەی کێبڕکێ نابێتەوە لەسەر کورسیەکانی دەسەلات ، لەبەر ئەوە دەبینین ئەندامەکانی کار بۆ خزمەتکردنی گەل ناکەن بەئەندازەی ئەوەی هەوڵدەدەن خۆیان لەسەرکردە نزیك بکەنەوەو متمانەی بەدەست بخەن[39] بەڵام سیستەمی تاك حیزبیش سیستەمێکی سیاسی نەگۆڕ نیە. ئەو کۆمەڵگایەی سیستەمی تاك حیزبی بەڕێوەی دەبات وەك ئەو کۆمەڵگایە وایە کە خێڵێك یان تایفەیەك فەرمانڕەوایەتی بکات چونکە حیزب بەرجەستەی ڕوانگەی گروپێك لە خەڵك یان بەرژەوەندی گروپێك لە کۆمەڵ یا بیروباوەڕێك یا شوێنێك دەکات. پاشان حیزب بەبەراورد بە گەل هەر کەمایەتیە[40].

---

[38]) هەمان سەرچاوە ، ل. ١٦٣ ، ١٦٥ ، ١٦٨.

[39]) محمود خيرى عيسى ، النضم السياسيه المقارنه، مكتبه الانجلو، القاهيره، ١٩٨٥ ، ص،٦٨.

[40]) هەمان سەرچاوە، ل. ١٩.

تاك حیزب بۆنمونە وەك ئەوانەی لەسەر شێوەی سۆڤیەتی سەردەمی کۆمۆنیزم دروستبوون. ئەم شێوە سیستەمە تاك حیزبیە لەسەر پرەنسیپی دیموکراسی مەرکەزی کار دەکات بەوەی کۆبونەوەکانی حیزب لەسەر گشت ئاستەکان، وەفدو سکرتێرەکانیان بۆ دەسەلاتی سەرەوە هەلدەبژێرن ، پێش بڕیاردان لەلایەن سەرەوە ، خوارەوە ڕێگای پێدەدرێ وتووێژ دەربارەی بابەتێك ئەنجام بدات بەڵام مەرکەز دەتوانێ ئەم دەستنیشان کردنانە بەکردارەکی هەڵبوەشێنێتەوە چونکە لە سەرەوە بۆ خوارەوە بریار دەدرێ کێ هەڵدەبژێردرێ. بەرپرسەکان بەرێگای سەرەوە دادەنرێن و لادەبرێن و ئەم بڕیارانەی دوایی هەڵناوەشێنرێنەوەو ناخرێنە بەر گفتوگۆ[41]. تەنانەت زۆرێك لەو حیزبانەش کەهیچ سۆزێکیان بۆ بیروباوەڕی کۆمۆنیزم نیە بەڵام لەژێر کاریگەریی شێوەی سۆڤێتی حیزبدان ئیتر زۆر ، یان کەم ، بۆنمونە حیزبەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست. ئەم کاریگەریە هەم لەسەر ئاستی ڕێکخستن دەردەکەوێ هەم لەسەر ئاستی سەرکردایەتی. پرەنسیپی ملکەچبونی ڕەهای خوارەوە بۆ سەرەوەو سەپاندنی ناوەندێتی توندوتۆڵ بەسەر ئەندامانداا زادەی خۆبەستنەوەیە بە شێوە سۆڤیەتەکە. تەنگەبەرکردنی پەراوێزی دیموکراسی و ئازادی ڕادەربڕین بەشێوەیەك کە ئەندامان تەنها لە چوارچێوەی شانەی حیزبیدا بۆیان هەیە ڕاوبۆچوونی خۆیان دەربڕن. لەسەر ئاستی سەرکردایەتی، ڕابەری حیزب نەك هەر دەسەلاتی ڕەهاو بێسنوری هەیە بەڵکو پیرۆزگەراییەکی تایبەتیشی بۆ دابینکراوە. بەم پێیە هەڵوێستی حیزب لە ڕوداوەکان و سیاسەتە گشتیەکانی ئەوەندەی پەیوەندی بە پێکهاتەی سایکۆلۆژی / کۆمەڵایەتی و

[41]) Hans Ritscher, Welt der Politik, Berlin, 1975, S. 42.

کەلتوری ڕابەرەکەیەوە هەیە ئەوەندە پەیوەندی بە پێکهاتەی ئایدۆلۆژی حیزبەوە نیە. تێهەڵکێش بوون و تێکەلاوبونی دەسەلاتەکان لەیەك دەسەلاتدا ئەمەش ڕوخسارێکی دیکتاتۆری و تۆتالیتاریزمە[٤٢]. یەکەم جار ئەم سیستەمە لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران دەرکەوت پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر. پاشان لە ئەوروپا سیستەمی یەك حیزب جلەوی دەسەلاتی کەوتە دەست لە هەریەکە لە ڕژێمە فاشیەکانی ئەڵمانیاو ئیتالیاو پاشان ئەم سیستەمە بووە سیستەمێکی سەرەکی لە زۆربەی دەوڵەتەکانی "جیهانی سێ". تائێستاش سیستەمی یەك حیزب لە چین و کوباو سوریاو کۆریای سەرو ، هەروەها لە ژمارەیەکی بەرچاو لە ولاتانی دیکەی ئاسیاو ئەفەریقا پەیڕەو دەکرێت[٤٣].

هەوڵی بەحیزب کردنی سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵ واتا گۆشەگیرکردن بە یەك ئایدۆلۆژیای دیاریکراوی حیزبی و تەسك کردنەوەی بیروفکری کۆمەڵ بەجیهانبینیەکی داخراو، ڕاهێنانیان لەسەر دەمارگیری حیزبایەتی دەبەخشێت لەناو بازنەیەکی تەسکدا کە دەرگای کردنەوەی مێشکی مرۆڤ بەرەو دیموکراسیەت و کۆمەڵگای مەدەنی دادەخات. ٣٥ ساڵ ئەزموونی فەرمانڕەوایی بەعس لە عێراق بۆ بەحیزبی کردن و بەعسی کردنی کۆمەلانی عێراق پاڵپشت بە ئایدۆلۆژیایەکی تۆتالیتاری داخراو نمونەیەکی بەرچاوە.

[٤٢]) کوردستانی نوێ ، نوسینی فەرید ئەسەسەرد ، ٧,١٢,٢٠٠٣ ، ژمارە ٣٢٣٨ ، ل.٧ .

[٤٣]) بەهادین ئەحمەد موحەممەد ، پارتە ڕامیاریەکان ، ل.٢٠٣.

## باسی دووەم

## تاك حیزب وەك دەسەلاتی ڕەها

لە ولاتە دیموكرات و پێشكەوتوەكان كە خاوەن پلورالیزمی سیاسین حیزب هەڵدەبژێردرێت و پەرلەمانیش لەگەڵیدا كە ئەمەی دواییان بالاترین دەسەلاتەو دواتر حیزب لە هەناویدا حكومەت پێك دەهێنێت. لێرەدا یاسای حیزب هەیەو حیزبەكان دەبێت ملكەچی یاساكانی بن كە هەرچەند ساڵێك دوبارە دەخرێتەوە بەردەم هەلبژاردنی گەل بۆ دەنگدان و بریار وەرگرتن لەسەری. بەهۆی نەبوونی حیزبی ئۆپۆزسیۆنی ڕاستەقینە تاك حیزب دەبێتە حیزبێكی دیكتاتۆرو بگرە تۆتالیتێرو دەسەلاتی ڕەهای دەبێت. شێوەیەك لە دەسەلات بەخۆیەوە دەگرێت كە گەل تێیدا مافی دیموكراسی نیەو دەسەلاتی دەوڵەت دەسەلاتی ڕووكەش دەبێت و دەسەلات و فەرمانڕەوایی تاك حیزب تێیدا دەسەلاتێكی سنوردارنەكراو، و ڕەها دەبێت. شێوەیەك دەبێت لە فەرمانڕەوایی كردنی سیاسی كە یەك تاك دەیگرێتە دەست كە هیچ كۆت و بەندێكی یاسایی، یان دەستوری، یان عورفی نایبەستێتەوە. بەم شێوەیە دیكتاتۆریەت جۆرێكە لە حوكمی ستەمكاری دیكتاتۆرەكان كە بەشێوەی نادەستوری دەسەلات دەگرنە دەست كە زۆربەی كات میتۆدەكانی هێز دەیپارێزن[٤٤]. دەسەلاتی سیاسی بە شێوە تەندروستەكەی مافێك نیە دەسەلاتدار بیبەخشێتە كەسی تر ، بیبەخشێتە حیزب ، بەمیرات بۆ دوای خۆی جێی بهێلێت ، بەڵكو دەسەلاتی سیاسی بەپێی یاساو دەستوور دەستاودەستی پێدەكرێت (دەستوری

---

[٤٤]) بورهان قانع ، فەرهەنگی نوێ ، وەرگێڕانی لەفارسیەوە بۆ كوردی ، ١٩٨٥، ل. ٩٦.

دیموکراسیانە). لێرەدا دەسەلاتی تاکێك ، گروپێك ، حیزبێك ، یان چینێکی کۆمەڵایەتی کە مۆنۆپۆلی (ئیحتیکاری) دەسەلات لە کۆمەڵ و دەوڵەتدا دەکات و ئەم دەسەلاتەش زۆربەی جار بێسنوور پراکتیزە دەکات[٤٥]. کەواتە سیستەمی دیکتاتۆری سیستەمێکی تاکە کەسیە، پەیوەستە بەکەسی دیکتاتۆرەوەو دیکتاتۆر خۆی دەسەلاتی ولاتی بەدەستەوەیە، خۆی خاوەن بڕیارەو لەو کارەدا پەنا دەباتە بەر خەڵکی لاوازو بێتوانا بۆئەوەی ئامێری دەستی خۆی بن و لە چوارچێوەی ئەو دەرنەچن. هەرچەندە دیکتاتۆر سوود لەخاوەن کەسانی ئەزموون و خەڵکی زاناو ئەکادیمیستەکان وەردەگرێ ، بەڵام تەکنۆکراتانە بیرناکاتەوەو ڕەفتار ناکات ، ئەو کەسانە بە وونی دەمێننەوەو لەسەر گۆڕەپانی سیاسی ولات و دەوڵەت دەرناکەون و دەسەلات نایەوێ ئەم توێژە بەشداری دەسەلات بکات. لەوەیە دیکتاتۆر ئەنجومەن و دەزگای جۆراوجۆر پێك بێنێ و وانیشان بدات کە سیستەمە سیاسیەکە دەزگای یاسادانان و دەزگای ڕاپەراندن و دادوەریی هەیە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمانە هەمووی ئەنجومەن و دەزگای دیکتاتۆرین بۆ چەواشەکردن و پەیڕەوکردنی سیاسەتی دیکتاتۆرانەی خۆی کە دیکتاتۆر بەکاریان دەهێنێت. هەندێ جار دیکتاتۆرەکان دەگەنە دەسەلات لە ڕێگای حیزبەکانیانەوە کە زۆرجار چالاکن و لە دەوری سەرۆکی حیزبەکەیان کۆدەبنەوەو قسەی پشت گوێ ناخەن و سەرۆکەکەیان دەگەیەننە دەسەلات و هەیبەت و نمووی بۆ دروستدەکەن و گەورەی دەکەن و خۆیانی پێدا هەڵدەواسن و سوودو بەرژەوەندی تاکی خۆیانیشی تێدایە[٤٦].

---

45) Kleines Lexikon der Politik, Dieter Nohlen, München, 2001, S. 65-66.

46) Peter Pawelka, Herrschaft und Entwicklung im Nahen Osten, Heidelberg, 1985, S.77-78.
بۆ زانیاری زیاتر بروانە

## باسی سێیەم

## تاك حیزب ، سیستەمێكی دیكتاتۆر ، نائەقلانی و نادیموكرات

حیزبی دیكتاتۆر پێچەوانەی سیستەمی دیموكراتی بریتی نیە لە سیستەمێكی ئەقلانی، شەرعی، دیموكرات[٤٧]. لەم سیستەمەدا كۆمەڵ دەبێت لەلایەن تاك حیزبی جەماوەریی فەرمانڕەوایی بكرێ. ئەم حیزبە لێرەدا لەژێر دەسەلاتی تەنیا یەك سەركردەدا دەبێت كە بەشێوەیەكی هیراكی و هەڕەمی و ئۆلیگارشی ڕێكخراوە. دەسەلات و فەرمانڕەوایەتیەكە ناوەندیەو ڕێگا نادرێ بە شێوازی ئاشتیانە دەسەلات دەستاودەست بكات. ئەم دەسەلاتە كۆنترۆڵی هەر سێ دەسەلاتە سەرەكیەكانی دەوڵەت دەكات كە بریتین لە دەسەلاتی (یاسادانان ، جێبەجێكردن و دادوەری). بەواتا لێرەدا مۆنۆپۆلی حیزب بوونی هەیەو تەنیا ئەو یەك حیزبە سەرجەم سیاسەتی گرتۆتە چنگی خۆی و بڕیارەكان بەتەنیا ئەنجام ئەدرێت. نە لەناو، وە نە لەدەرەوەی حیزب ئۆپۆزسیۆنی پێ پەسەند نیە. لەبەر ڕۆشنایی قەدەغەكردنی تەكەتولات بەتەنیا سەرووی حیزب فەرمان دەردەكات. لێرەدا ڕێكخراو، و گروپی ئاوتۆنۆم نیە. گشت ئەمانە لەژێر كۆنترۆڵی حیزبدان. حیزب شێوە ئەدات بە گروپەكان و بەڕێوەیان دەبات ، بەجۆرێك كە گشت مرۆڤەكان چەند جارێك چاودێری دەكرێن ، بۆنمونە سەندیكا و ڕێكخراوە پیشەییەكان. بە جۆرێك كە كەسی تاكیش وەك تاك ، نەك وەك گروپ هەمیشە ڕوبەڕووی بەرەی داخراوی حیزب و ئایدۆلۆژیاكەی دەبێتەوە كە ئەم بەرامبەری بێدەسەلاتەو لەم دیدو جیهانبینیەی دەسەلاتەوە دەبێت

---

[47]) Max Weber, Wirtschaft und Gesellschaft, Tübingen, 1980, S. 551.

هەرواش بمێنێتەوە.[48] سیستەمی دیکتاتۆرو تاك حیزب وەك تەواوی سیستەمە دیسپۆتیزم و تۆتالیتێرو ستەمكارەكان ناتوانێت خۆی ڕابگرێت بێئەوەی بواری ژیانی گشتی و توانا سیاسیەكانی مرۆڤەكانی كۆمەڵگاكەی تێك نەشكێنێت. ئینتیمای بۆ ڕژێمێكی وەسفكراوی نوێ هەیە كەتەنها پشت بە (گۆشەگیركردن) نابەستێ ، بەڵكو لە هەوڵی ئەوەشدایە ژیانی تایبەتی مرۆڤەكانیش كۆنترۆڵ بكات. ئەوە سەبارەت بە تێڕوانینی حیزبی دیكتاتۆر بۆ مرۆڤەكان و تاكی كۆمەڵگا ، هەروەها لێرەدا مۆنۆپۆلی ڕێكخراوەییش پەیڕەو دەكرێ[49]. ئەم شێوە دەسەلاتە بەرگری لە دەسەلاتەكەی بەرێگای ئایدۆلۆژیاوە دەكات چونكە حیزب لەو ئامانجە دروستبوە ئامانجەكانی ئایدۆلۆژیا بەدی بهێنێت. لێرەدا ئایدۆلۆژیا بۆ حیزب دوو واتایە: بۆ ئامانجی شەرعیەتدان وە هەروەها وەك ئامرازی دەسەلات[50].

## باسی چوارەم

## تاك حیزب بۆ دەوڵەت وەك ئامرازی دەسەلات

سیستەمی تاك حیزب فەرمانڕەوایی دەولەت وەك ئامرازی دەسەلاتەكەی بەكار دەهێنێت، بۆ هەر دامەزراوەیەكی دەوڵەتیی هاوتەریب بەو دامەزراوەیەكی

[48]) Reinhard Kuhn, Welt der Politik, Berlin, 1971, S. 35-36.

[49]) د. سالار باسیره ، تۆتالیتاریزم ، توێژینەوەیەكی زانستی ، گۆڤاری زانكۆی سلێمانی بەشی B ، زانستە مرۆڤایەتیەكان ، ژمارە ٢٣ ، ٢٠٠٨ ، سلێمانی، ل.٤٠ .

[50]) Reinhard Kuhn, S. 42.

حیزبیش هەیە کە ناوەڕۆکەکەی بریتیە لە خاوەن دەسەلات خۆی. بۆنمونە وەزارەتی ماف مرۆڤ هەیە ، کەچی مەکتەبی ماف مرۆڤی حیزبیش هەیە. ئەدۆلف هیتلەر دەلێت: *"ئەوە دەوڵەت نیە فەرمان بە ئێمە دەکات ، بەڵکو ئێمەین فەرمان بەسەر دەوڵەتدا دەکەین*[51] *".ئەم بۆچوونە بنەما فکریەکەی دیکتاتۆر نیشان ئەدات سەبارەت بە دەوڵەت.* لێرەدا دامەزراوەکانی دەوڵەت لەلایەن کەسەکانی حیزب داگیردەکرێن. هەربۆیە دەوڵەت و حیزب ، یان حکومەت و حیزب لەبەرەوە وا بەناو یەکتردا دەتوێنەوە کە لەیەکتر جوداکردنەوەیەکی تەواو نزیکەی ئاستەمە. هاوڕێیەتی لەنێوان کەسە چالاك و بەرپرسانی ئەم شێوە حیزبە زۆر کزە. هەریەکەو حوکمی ئەوی تر بەوە ئەدات چی بۆ حیزب دەکات. مرۆڤ لەم جۆرە سیستەمەدا کەسی خاوەن ماف نیە بەڵکو کەرەسەیەکی خزمەتە، کە بەپێی خزمەت کردنی بۆ حیزب و باوەڕی پێوانە دەکرێ [52].

لە سیستەمی یەك حیزبیدا بەتایبەت ئەو حیزبانەی باسی ئایدۆلۆژیا دەکەن وەك ئەوانەی ئەدۆلف هیتلەرو مۆسۆلینی و ستالین و سەدام...، بەڵام لە ئەنجامدا ئایدۆلۆژیا لە کەسایەتی یەکەمی حیزبدا کۆدەبێتەوەو سروشت و ئارەزوی خوودی ئەو تاکە کەسە دەبێتە هەموو حیزب و حیزب لەودا کۆدەبێتەوە. حیزبی بەعس لە عێراق لە کاتی فەرمانڕەوایی سەدام حوسێندا بەم شێوەیە بوو. هەرچەندە لە پەیڕەوی ئەم دواییەی حیزبی بەعسدا باس لە هەڵبژاردنی ئەندامانی (قیادەی قەومی و قیادەی قوتری) و...تاد. دەکات بەڵام

[51]) هەمان سەرچاوە ، ل. ٤١.

[52]) Hans Ritscher (Hg.), Welt der Politik, Totalitäre Herrschaft, Berlin, 1971, S. 35.

لە کۆتاییدا سەدام حسێن حیزبی بەعس و حیزبی بەعسیش سەدام حسین بوو. دەوڵەتی حیزبیی بەدەوڵەتێك دەوترێ کە دەسەلاتی دەوڵەت لە ناوەڕۆکدا لە دەستی حیزب و کۆمەڵێکی بەرژەوەندی بێت. چەندین ڕەخنە ڕوبەڕووی سیستەمی تاك حیزبی دەبنەوە کە بریتین لە قۆرخ کردنی دەسەلات، بلاوبونەوەی گەندەڵی و بیرۆکراسیەت.

## باسی پێنجەم

## سیستەمی دوو حیزبی و فرەحیزبی لە بەراوردا

بۆ تێگەیشتنێکی زیاتر سەبارەت بە سیستەمی تاك حیزبی توێژەر بە باشی زانی وەك بەراوردێك لە ڕووی زانستی سیاسیەوە ئاماژەیەك بە سیستەمی دوو حیزبی و فرەحیزبی بدات. سەبارەت بە سیستەمی دوو حیزبی وەك ئەوەی لە بەریتانیاو ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەیە بەوەی کە دوو حیزبی گەورە هەبن یەکێکیان لە دەسەلاتداو ئەوەی تر لە ئۆپۆزیسۆندا بێت. سیستەمی دوو حیزبی بۆنمونە لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا زیاتر لە سەد ساڵە پیادە دەکرێ کە بریتین تەنیا لە هەردوو حیزبی دیموکراتەکان و کۆماریەکان. کۆمەڵێك لە حیزبی تر هەن بەڵام تەنیا دووان توانیویانە خۆیان لەسەر گۆڕەپانی سیاسی بنوێنن و بتوانن بە تەنیا حکومەت پێکبهێنن. لە سیستەمی دوو حیزبیداو لە دەوڵەتی دیموکراتیدا دەستاودەست کردنی ئاشتیانەی دەسەلاتی دوو حیزب هەیە. لە سەدەکانی ١٨ و ١٩ لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا حیزبی تر هەبوون و هەیە بەڵام بەزۆری تەنیا دوو حیزبی گەورە

هەبووەو هەیە[٥٣]. بەریتانیاش بەهەمان پرۆسەی سیاسیدا ڕۆیشتوە بەڵام لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی هەردوو حیزبی کرێکاران و کۆنزەرڤاتیڤەکان شوێنیان گرتنەوە.

سیاسەتزانی ئیتالی Giovanni Sartori چەند خەسڵەتێکی داوەتە سیستەمی دوو حیزبی:

١) لە کاتی هەڵبژاردنە گشتیەکاندا هەریەك لە دوو حیزبە گەورەکە لە توانایدایە زۆرایەتی ڕەهای کورسیەکان لە پەرلەمان بەدەست بهێنێت. دەسەلات لە نێوان دوو حیزبە گەورەکەدا بە ڕێگای هەڵبژاردنەوە بگۆڕدرێت و بگوازرێتەوە.

٢) ئەم حیزبە ئامادەو توانای هەیە بەتەنیا فەرمانڕەوایی بکات[٥٤].

ئەوەی پەیوەندی بە فرەحیزبیەوە هەیە ئەم سیستەمە توخمێکی سەرەکیە لە توخمەکانی بوونی دیموکراسی لە ولاتێکدا بەڵام گرنگە حیزب و ڕێکخراوی سیاسی بەپێی پێویستیە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان دروستببێت[٥٥]. ئەو بڕیارە سیاسیانەی لە ولاتی فرەحیزبیدا دەردەچن بڕیاری چەندین ئەلیتەو سەرکردەو لایەنی شارەزان ، یەك ئەلیتەو یەك لایەن دەریانناکەن. فرەحیزبی بە واتای جیاوازی دێت لە فیکرو بەرژەوەندی هەمەلایەنەی پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکان. پلورالیزمی سیاسی ڕێگایەکی گرنگ و گونجاوە بۆ

---

53) de.wikipedia.org/wiki/Zweiparteiensystem.

54) Giovanni Sartori , Parteien und Parteiensysteme, Berlin, 2007, S.37.

٥٥) دەستور ، ٣٠،٦،٢٠١٠ ، ژمارە ٣٨.

گەشەسەندن و پێشکەوتن و دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن وەك خەسڵەتێکی کۆمەڵگای مەدەنی.

"بەر لە هەموو شت فرەحیزبی واتە دانانان بەبوونی هەمەجۆریی لە کۆمەڵگادا ، بوونی چەندین بازنەی ئینتیما لەناو یەك شوناس. هەروەها ڕێزگرتن لەو هەمەجۆریەی و قبوڵکردنی دەرئەنجامەکانی لە ناکۆکی و جیاوازی بیروباوەڕ لە بەرژەوەندی و شێوازی ژیان و گرنگیپێدان ، هەروەها هێنانە ئارای دارشتەیەکی گونجاو بۆ دەربڕینی ئەو هەمەجۆرییە بە ئازادی و لە چوارچێوەیەکی گونجاودا"[٥٦]. بۆ ئەوەی پلورالیزمی سیاسی یا فرەحیزبی لە ولاتێکدا هەبێ ، دەبێ ئەم شتانە فەراهەم بن:

١) دەبێ سیستەمێکی یاسایی هەبێ و تەواوی مافەکان بۆ دەستەو تاقمە کۆمەڵایەتیەکان دەستەبەر بکات وەك رێکخستنی سەربەخۆو گوزارشت کردن لە بیروڕاکانیان ، هەروەها پێدانی ماف بە هەموو دەستەو گروپە کۆمەڵایەتیەکان کە هەوڵبدەن بە ڕێگایەکی ئاشتیانە بگەن بە دەسەلات لەژێر چەتری ڕێکخستنێکی یاسادارێژانە کە ڕێگا بەو شتانە بدات و یاساڕێژیان بکات.

٢) دەبێت لە نێوان گەل و حکومەت ڕێکخستنێك هەبێ تا پرۆسەی سیاسی ڕێکبخات وەك ئەو حیزبە سیاسیانەی کە بوون بە دیاردەیەکی گرنگ و ناکرێ لە سیستەمی سیاسی دیموکراسی هاوچەرخ دایانبڕین چونکە چەندین ئەرك بەجێدەگەیەنن ، وەك ڕێکخستن ، پەیوەندی نێوان کۆمەڵ و دەسەلات...تاد[٥٧].

---

[٥٦]) کۆمەڵێك نووسەر ، ل. ٧١–٧٢.

[٥٧]) هەمان سەرچاوە ، ل. ٧١.

# بەشی چوارەم
# حیزبە تەقلیدی و شمولیەکان و میتۆدەکانی حیزب بۆ گەیشتن بە دەسەلات

## باسی یەکەم
## کۆمەڵ لە سایەی حیزبە تەقلیدی و شمولیەکان

حیزبە تەقلیدی و شمولیەکان کە حیزبی دیکتاتۆرین ئیتر هەر ناوێکی بەخۆیەوە نابێت ، پەرلەمان و حکومەت تێیدا بێکاریگەرەو لەلایەن حیزبەوە فەرمانڕەوایی دەکرێت و حیزبیش لەم سیستەمەدا حیزبی قائیدە. سەرۆکی حیزب لێرەدا دەیەوێ ڕۆڵی کاریزما ببینێت و بەرگی حیزب و ئایدۆلۆژیاش بکرێنە بەری ئەم. لەم سیستەمەدا دارودەستە کارەکان دەبەن بەڕێگاوەو سیستەمەکە لەسەر بنەمای ئەقڵ و مەنتق دانەمەزراوەو بڕوای بە سیستەمی لامەرکەزی نیەو هەربۆیە لەگەڵ بنەما دیموکراسیەکان یەکتر ناگرێتەوە. کۆمەڵگا لە سایەی ئەم شێوازی دەسەلات و سیستەمە سیاسیە حیزبیەدا گەشە ناکات و ئابوریش تێیدا گێڕ دەبێت ، هەربۆیە گرنگە لە ڕوانگەی زانستی سیاسیشەوە بۆ شیکردنەوەی حیزب و سیستەمی سیاسی بڕوانین. سیستەمی سیاسی پەیڕەوکراو لە ولات و دەولەتێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ. لەهەر دەولەتێکدا ڕادەی هوشیاری سیاسی کۆمەڵ و بیروبۆچوونی مرۆڤەکانی دەربارەی دەسەلات لەسەر بنچینەی قۆناغە مێژوییە جیاجیاکان بەخۆوە وەردەگرێ کە دەولەتی پێدا ڕۆیشتوە. هەربۆیە حیزبیش بەرهەمی واقعی ئەو

کۆمەڵگایە خۆیەتی. خەسڵەتی کۆمەڵگای تەقلیدی بریتیە لەکردەوە تەقلیدیە کۆمەڵایەتیەکان. واتا ئەو کردەوانەی کە لەسەر بنەمای ئەقڵ و مەنتق دانەمەزراوە بەڵکو لەسەر بنەمای ئەو کردەوانەی کە سەردەمانێك کاری پێکراوەو جێگیربوەو بەمیرات ماوەتەوە وەك شتێکی تەقلیدی. یەکێك لە خەسلەتەکانی کۆمەڵگای تەقلیدی بریتیە لە پێکهاتەیەکی داخراوی کۆمەڵایەتی کە بە گران خۆی دەداتە دەست گۆڕانکاری بەتایبەت بەمۆدێرن کردنی هەرەمی سەرەوەی. زۆربەی ئەندامانی ئەم کۆمەڵگایە سەربەخۆییان نیە، بەستراونەتەوە بە نەریتی گشتی کۆمەڵگاکە. لێرەدا باری ئاینی زاڵە بەسەر تەواوی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگاکە. دەسەلاتی سیاسیش خەسڵەتێکی حوکمی فەردیە تێیدا. هەربۆیە ئەم جۆرە کۆمەڵگایە هەروەك ئاماژەی پێدرا بەپێی سروشتی خۆی ، خۆی کەمتر دەداتە دەست بەمۆدێرن کردن. زیاتر لە شوێنی خۆی دەچەقیَ و گۆڕانیشی کاتێکی دورودرێژی دەویَ کە ئەمیش بەندە بەکۆمەڵێك فاکتەرەوە. لەم سیستەمە تەقلیدیەدا ئابوری خزمایەتی و بارودۆخی پابەندبوون و پەیوەندی شەخسی دروستدەبێت و ڕۆل دەبینێت. دەسەلاتەکە دەسەلاتێکی کلاسیکیەو هوشیاری کۆمەڵ لەئارادا نیەو دەسەلاتداری تەقلیدی سوود لەم دیاردەیە وەردەگریَ و دەشیەویَ کەش و هەوا کۆمەڵایەتیە دواکەوتوەکە هەر بەم شێوە کۆنە بمێنێتەوە لە شێوەی داب و نەریتە تەقلیدیەکان. هەموو ئاڕاستەیەکی مۆدێرنیزم و پێشکەوتن و هوشیاری کۆمەڵایەتی دەبێتە لاوازکردن و گۆڕینی ئەو نەریتە تەقلیدیەی کە دواتر دەبێتە ڕێگر لە بەردەم دەسەلات و سیستەمە سیاسیە تەقلیدیەکەدا (کلاسیکیەکەدا). هەربۆیە بەگشت شێوەیەك ئەم لایەنە هەوڵی لەناوچوونی

پێشکەوتن ئەدات و دەیەوێ کۆمەڵگا کۆنەکە کۆمەڵگایەکی داخراو بێت و بەهۆی ناهوشیاری کۆمەڵەوە بۆی بچێتە سەرو دەسەلاتدار جێگای یاساش بگرێتەوەو دەیەوێ لەم زیاتر کۆمەڵ هیچیتر نەبینێت و بەم شێوەیە کۆمەڵگا بێبەش دەکات لەمێژوش[٥٨].

لەو کۆمەڵگایانەی هوشیاری سیاسی لای هاولاتیان کزو لاوازەو هەروەها ڕەوشی ئابوری و کۆمەڵایەتی تیایاندا لاوازە ئەوا سیستەمی سیاسی پەیڕەوکراو لە دەوڵەتدا سیستەمێك دەبێت کە لەسەر زەبروزەنگ و خۆسەپاندن بنیاد دەنرێت. لێرەدا پێشێلکردنی ماف تاکەکانی کۆمەڵ و سەربەستیەکانیان و بوارنەدان بەگروپی سیاسی جۆراوجۆر لەدەوڵەتدا شتێکی ئاسایی دەبێت. واتا سیستەمی دیکتاتۆری لە دەوڵەتدا پەیڕەو دەکرێت ، ئیتر ئەو سیستەمە دیکتاتۆریە سیستەمی دیکتاتۆری تاکە کەسی بێت ، یان سیستەمی دیکتاتۆری ڕێچکەیی بێت[٥٩].

ئەم جۆری سیستەم و دەسەلاتە سیاسیە دەیەوێ لەسەر زەمینێکی تەواو گۆڕاودا بەئەقڵی نەگۆڕ کار بکات. لە سیاقێکی سیاسی و مێژویی و کۆمەڵایەتی گۆڕاودا دەیەوێ بەپێی هەمان سیاق و ئەقڵی کۆن ئیش بکات ، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشت و پێکهاتەی ئەو دەسەلات و حیزب و سیستەمە

---

58) Max Weber, S. 130.

٥٩) بەهادین ئەحمەد محەمەد، تیۆری دەوڵەت و سیستەمە ڕامیاریەکان ، ل ، ١٦٨.

سیاسیە تەقلیدیە کە بەرهەمی دونیای ترادیسیۆن و بەر لەمۆدێرنەیە. حیزبەکانی ئەم شێوە دەسەلاتە ناکرێ حیزبی تەقلیدی و شمولی نەبن لە بیرکردنەوەو لە کرداردا. بە پێچەوانەی دەسەلات و سیستەمی ئەقلانی و پێشکەوتو وەك ئەوەی ڕۆژئاوا کە درەنگ هاتۆتە کایەوە زۆربەی سیستەمە سیاسیەکانی تر هەر هێشتا دەسەلات و سیستەمی تەقلیدیە لە پراکتیزە کردنی شێوە نائەقلانی و کلاسیکیەکەی دەسەلات. هەربۆیە قۆناغی گواستنەوە بۆ دیموکراسیەت و مۆدێرنیزم کە حیزب دەکرێ ڕۆڵی گرنگی تێدا ببینێت پرۆسەیەکی قورس و ئاڵۆزە[٦٠]. بەشێکی بەرچاوی دەوڵەتان و سیستەمە سیاسیەکانی "جیهانی سێ" بەدەر نیە لەم ڕیالیزمە.

## باسی دوەم

## سەپاندنی سیستەمی دەسەلات و حیزب

پەیڕەوکردنی هەر شێوەیەك لە سیستەمی دەسەلات و حیزب لەدەوڵەتدا شتێك نیە بەزۆر بسەپێندرێ ، یان هەتا سەر بڕبکات و نەگۆڕ نەبێت. ئەگەر سیستەمە سیاسیە پەیڕەوکراوەکە لەگەڵ باری کەلتورو سایکۆلۆجی و فکری و کۆمەلآیەتی خەڵکی ولاتدا گونجاو نەبوو ئەوا ئەو سیستەمە سیاسیە بە حیزبیشەوە ئەگەر بۆ ماوەیەکی زەمەنییش پەیڕەو بکرێت بەلآم وەکو ئەنجام

[60]) Wolfgang Laskowski, Macht und Herrschaft, Seminararbeit, WS 2001/02, Manuskript, S. 23.

هەر هەرەس دێنێت و ئامانجی ڕێکخستنی دەوڵەت ناپێکێ کە لەڕاستیدا پێویستە بۆ خۆش گوزەرانی و سەقامگیرکردنی ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری هاتبێتە کایەوە.

## باسی سێیەم

## میتۆدەکانی گەیشتنی حیزب بە دەسەلات

زۆرن ئەو میتۆدانەی کە حیزب (دەسەلات / ئۆپۆزسیۆن) بەکاری دەهێنێت بۆ گەیشتن بە دەسەلاتی سیاسی ، مانەوەی دەسەلات و پارێزگاری کردن لێی. لێرەدا ئاماژە بە هەندێك لەو میتۆدو ئامرازانە ئەدەم:

**(زەبروزەنگ و ئاشتی وەك میتۆدی گەیشتن بە دەسەلات)**

هەندێك جار حیزب (حیزبی دەسەلات / ئۆپۆزسیۆن) دەیەوێ بەرێگای ئاشتیانە دەسەلات دەستاودەست بكات. بۆنمونە لە ڕۆژئاوای ئەوروپا. هەندێکی تر بەڕێگای شۆڕش و خەباتی چەکداری و توندوتیژیەوە دەیەوێ بگاتە دەسەلات بۆ دروستکردنی سیستەمێکی سیاسی تری جیاواز لەوەی پێشوو. هەندێ جاریش بەرێگای فشاری شەقام و ڕاپەڕینی جەماوەری و شۆڕشی کۆمەڵایەتی. مێژووی مرۆڤایەتی بەگشتی بریتی بوە لە مێژووی هەوڵدان لە پێناوی دەسەلات و ئابوریدا. لەم پێناوەشدا مرۆڤایەتی هەموو ڕێگاو ئامرازێکی جۆراوجۆری گرتۆتەبەر. ئەم ڕێگایانەش بەپێی قۆناغەکانی مێژوو وەك یەك نەبوون. بۆنمونە لەسەردەمی مێژووی ڕۆمیەکان ، یان تەتەرو

مەغۆلەکان ئازایەتی شەڕی بەدەنی و شمشێر وەشاندن و پێشڕەوی کردنی سوپا بۆ گۆڕەپانی جەنگ و ئازایەتی نواندن تێیدا چەقی دەرکەوتن بوەو هەیبەتی داوەتە مرۆڤەکەو گەیاندویەتی بە پایەو پلەو دەسەلات. خۆ ئەگەر کەسەکە سەر بە بنەماڵەیەکی ناسراو بوبێت ئەوا ناوبانگی بنەماڵەکەشی ڕۆڵی گرنگ و تایبەتی خۆی بینیوە. ئەم فاکتەرە شانبەشانی دەوڵەمەندی و خاوەن دارایی وایکردوە کەسەکە زووتر بگات بە دەسەلات. ناسراوی بنەماڵەو خەلافە فاکتەرێکە کە هەتا ڕۆژی ئەمڕۆش بەتایبەت لە ولاتە دوا ، یان نیمچە دواکەوتوەکان ڕۆڵی گرنگی خۆی دەبینێ و ئەم بڕیارەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی چونکە شێوەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و جۆری بیرکردنەوەکان هەر هێشتا بەم شێوەیە تێیدا دەژی. هەرچەندە شێوەکانی دەسەلات و سیستەمی سیاسی بەپێی ڕەوتی مێژوو، و بەپێی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئابوری وەك یەك نەبوون بەڵام لە ناوەڕۆکدا بۆ دوو مەبەستە سەرەکیەکە بوە کە بریتی بوە لە دەسەلات و ئابوری ، بەڵام پرسیارەکە هەمیشە لەوەدایە دەسەلات و ئابوری لەدەستی کێداو بۆ کام مەبەست؟

**(شوێن و زەمەن لە دەسەلات و ژیانی سیاسیدا)**

دەسەلاتداران بۆ گەیشتن ، یان بۆ پارێزگاری کردن و بەردەوامیدان بەدەسەلاتەکەیان دەبێت ڕەچاوی شوێن ، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ، باری ئابوری ، سیاسی ، هوشیاری کۆمەڵ ، لایەنی ڕۆشنبیری ئەو کۆمەڵ و ولاتە بکەن[٦١]. ئەو سیاسەت و دەسەلاتەی حیزبی نازی ئەڵمانی لەژێر سەرکردایەتی ئەدۆلف هیتلەر لە سەردەمی خۆیدا بەکاریهێناوە بەڵام دەسەلاتی سیاسی

٦١) بەهادین ئەحمەد محەمەد ، تیۆری دەوڵەت و سیستەمە ڕامیاریەکان ، ل. ٣٦.

ئەمڕۆ لە ئەڵمانیا ناتوانێت هەمان سیستەمی سیاسی بەو شێوە ئایدۆلۆژیایەوە لەبەر چەندین فاکتەر پیادە بکات. لە قۆناغێکی مێژوییدا وابوە کە حیزبی نازی فەرمانڕەوایی کردوەو میللەتیش قبوڵی بووە. کەواتە بوونی ئەو حیزب و ڕژێم و کەسانە بەرهەمی واقعی ئەو کۆمەلگایە خۆی دەبەخشن و ئەوەندەش ئەو واقیعە بەهەمان بارودۆخ بمێنێتەوە ئەوا دەسەلات و سیستەمە سیاسیەکەش ماوەیەکی درێژ لەسەر تەمەن دەمێنێتەوە. دەسەلاتی دیکتاتۆری لە ڕێگای کودەتای سەربازی و زەبروزەنگەوە دێتەکایەوە ، بەڵام هەندێ جار دیکتاتۆر دەکرێ بەشێوەیەکی ئاسایی و دیموکراسی دەسەلات بگرێتە دەست و پاشان دیکتاتۆریەتی خۆی بسەپێنێ و دیموکراسی لە ولاتدا لە نێوببات و کاریگەریی خۆی لەسەر سیستەمە سیاسیە نوێکە پراکتیزە بکات. حیزبی نازی لە ساڵی ١٩٣٣ لە کەشوهەوای دیموکراسی کۆماری ڤایمار بە هەڵبژاردن گەیشتە دەسەلات[٦٢]. پاشان هەموو دامودەزگا دەستوریەکانی تێکداو دیکتاتۆرانە

٦٢) دەسەلات فەرمانڕەوایی کۆمەڵ دەکات. دەسەلات هەمیشە زەمینە بۆ دەسەلاتدار دروستدەکات بۆ گوێڕایەڵ کردنی بەرامبەرەکەی و سەپاندنی فەرمان و ویستی خۆی بەسەریدا دژ بەهەولّی ڕاپەڕینیشی. هەروەها دەسەلات ئەو ئیمکانیەتە دروستدەکات دژەکان ناچاری هەنگاوی گونجاو بکات بەڵام گونجاو لە بەرژەوەندی و خواستی (دەسەلات – داردا)، ئەگەر پێویستیش بوو دەیەوێ بە زەبروزەنگ (لە سیستەمە دیکتاتۆرەکاندا) ناچاری بکات ، ئیتر شێوازی ئەو زەبروزەنگە چیەو چۆنە ئەوە سروشت و پێکهاتەی دەسەلاتە سیاسیەکە دیاری دەکات ئیتر تاك بێت ، یان گروپ ، یان دەزگا بێت ، خاوەن دەسەلات هەول ئەدات ڕەفتار بەسەریدا بسەپێنێت. هەرچەندە مەرج نیە دەسەلات هەمیشە بەندبێت بەزەبروزەنگەوە بەڵام دەسەلات سەلامەتترو گەورەترە کە بەندبێت بە ڕەزامەندیەوەو کەمتر بەرێگای ناچارکردنەوە. ئەگەر دەسەلاتدار نەیەوێ دەسەلاتەکەی بکەوێتە ژێر مەترسیەوەو بیەوێ لەدەستی نەدات ئەوا دەبێت ڕەچاوی بەرژەوەندی حوکمکراوەکانیش (دەسەلات بەسەرەکانیشدا) بکات. ئەو لایەنەی سیاسەت پیادە دەکات هەولّ بۆ دەسەلات ئەدات. دەسەلات وەك ئامراز لە پێناوی ئامانجی تردا ، یان لە پێناوی ئیرادەی خۆییدا بۆ خۆشی

فەرمانڕەوایی ئەڵمانیای کردو ئەو دەوڵەتەو بەشێکی جیهانی ڕوبەڕووی جەنگێکی دژوار کردەوەو زیانێکی زۆری گیانی و ماددی بەئەڵمانیا و جیهان گەیاند[٦٣].

**(میتۆدی دین)**

دین یەکێکی ترە لەو فاکتەرانەی بۆ مەبەستی گەیشتن بە دەسەلات بەپێی بارودۆخی کۆمەڵ و ڕەوتی مێژویی کۆمەڵ لەلایەن حیزب و سیستەمە جۆراوجۆرەکانەوە بایەخی پێدراوەو کراوەتە ئامرازێك بۆ گەیشتن و مانەوە لەسەر دەسەلات[٦٤] ، بۆنمونە داعش لە عێراق و سوریا ، تالیبان لە ئەفغانستان، هەروەها لە عێراق و دەسەلاتی سیاسی لە ئێرانیش...تاد. لە ئێران دین لە خزمەتی ناسیۆنالیزمی فارسدایە.

**( فاکتەری ئابوری )**

فاکتەری ئابوریش جێگای تایبەتی خۆی هەبوە بۆ ئەم ئامانجە. باشکردنی باری ئابوری و کەمکردنەوەی بێکاری فاکتەرێکی تری گرنگە بۆ ڕاکێشان و نزیك کردنەوەی کۆمەڵ لە حیزب و دەسەلاتدار ، یان بۆ بەهێزکردنی دەسەلات.

---

وەرگرتن لەو دەسەلاتە. کەسایەتی ناسراوی فەرەنسی چارلس ماوریس پێش زیاتر لە ٢٠٠ سال وتویەتی:"بەقەمەی سەر تفەنگ مرۆڤ دەکرێ هەموو شتێك بکات بەڵام ناکرێ لەسەری دابنیشێت". ناچارکردن و هێزو زەبروزەنگ ئامرازە بۆ دەسەلات و مانەوەو بەردەوام بوون لە دەسەلاتدا بەڵام ناشتوانرێت هەتا سەر خاوەن دەسەلات بەکاری بهێنێت.

63) Faschismus; Ursachen und Politik des deutschen Faschismus, S. 4

64 Unsere Zeit, Berlin, 26.10.1990, S. 3.)

**(وێنای دوژمن)**

یەکێکی تر لە فاکتەرەکان بۆ گەیشتن و مانەوە لەسەر دەسەلات بریتی بوە لە دۆزینەوەی وێنای دوژمن و بەم هۆیەوە ئاماژەکردن بە پێویستی بوونی ململانێی توندوتیژ لە بەرژەوەندی ئەو دەسەلات و ڕژێمە. حیزبی نازی یەهودیەکانیان کردبوە وێنای دوژمن و حکومەتی تورکیاش کورد... ئەم میتۆدە نویێ نیە لە مێژوودا.

**(فاکتەری جەنگ )**

ئەم فاکتەرەش وەك ئامرازی سیاسەت لەخزمەتی دەسەلاتدا بووە[٦٥]. جەنگ دەکریێ وەك ئامراز بۆ گەیشتن بە دەسەلات بەکار بهێنرێت و هەروەها بۆ سەرقاڵکردنی جەماوەر بەشوێنی ترەوە. بەڵام ئەم ئامرازەش ئەمڕۆکە بۆ گەیشتن بە مەبەستی دەسەلات بە گەڕانەوە بەرەو دواوە سەیر دەکریێ. جەنگ هەمیشە بریتی بووە لە سیاسەت و درێژکەرەوەی سیاسەت بووە بە شێوەی توندوتیژ ، هەروەك چۆن ئاشتیش سیاسەتە بەرێگای ئاشتیانە. هەردوو جەنگی کەنداو (جەنگی عێراق و ئێران و داگیرکردنی کوەیت لە لایەن حیزبی بەعسەوە) نمونەیەکی بەرچاوی بۆچونەکەیە.

**(ئایدۆلۆژیا)**

ئایدۆلۆژیاش یەکێکی ترە لەم ئامرازانە. دەمارگیریی نەتەوەیی (ناسیۆنالیزم) یەکێکە لە فاکتەرە ئایدۆلۆژیەکان و بۆ ئەم ئامانجە کاری پێکراوە. بۆنمونە

65) Fadil Rasoul, Irak-Iran, Wien 1987, S. 170, S. 46.

حیزبی بەعس و نازیەکانی ئەڵمان ناسیۆنالیزم و سیاسەتی ڕاسیزم بۆ کارتێکردنە سەر گەلەکانیان وەك ئامراز بەکارهێناوە. حیزبی نازی بەرگری لە دەسەلاتەکەی بەوە دەکرد کە ڕەگەزی ئاری ئەڵمانی بەرزەو ڕەگەزێکی تایبەتەو لەسەرو نەتەوەکانی ترەوەیە. ئەگەر هات و میللەت ئەم فکرەیەی بە شەرعی بینی بۆ ئەو ڕژێمەو بەڕەزامەندی خۆی دوایکەوت ، ئەو کاتە دەسەلاتەکە دەکرێتە دەسەلاتێکی شەرعی بەڵام مەرج نیە دەسەلاتێکی دیموکراسی بێت. بەعس فکری ناسیۆنالیزمی (القومیە العربیە)ی کردبوە ئایدۆلۆژیاو وەك ئامرازی سیاسی بەکار دەهێنرا. لە ئێران و سعودیە دەمارگیریی ئیسلامیزم وەك ئایدۆلۆژیا... تاد. ئەو جۆرە سیستەمە سیاسیانە بۆ ئەم مەبەستە هەوڵ ئەدەن بە ڕێگاو یارمەتی ئایدۆلۆژیایەك وا تەئسیر لە ژێردەستەکانیان و لە جەماوەر بکەن کە یەکبگرنەوە لەگەڵ ئایدۆلۆژیای ئەو حیزب و لایەنە دەسەلاتدارەو بەم جۆرە بتوانن شەرعیەت بدەن بە فەرمانڕەوایەتیەکەیان. بەواتا ئایدۆلۆژیاش یەکێکە لەو ئامرازانەی کە حیزب و دەسەلاتدار بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆی بەکاری دەهێنێت و لێرەدا حیزب و دەزگاکانی باشترین ڕێگایە بۆ شۆڕبونەوەی بیروفکری دەسەلاتدار بەناو شادەمارەکانی گەلدا ، ئیتر دروشمی سۆسیالیزم ، لیبرالیزم ، ناسیۆنالیزم ، ئیسلامیزم یان کۆمۆنیزم بێت. بۆئەوەی بەم ڕێگایانەوە حیزب و جەماوەر لە دەوری سەرۆکیش کۆبکرێتەوەو خەڵکی ڕووی تێبکەن و شەرعیەت بۆ دەسەلاتەکەی پەیدا بکرێت و درێژە بەژیانی دەسەلات بدات ئیتر بۆ هەر کام لە مەبەستەکان بێت.

**( دیکتاتۆریەت و تۆتالیتاریزم ، میتۆدێکی تر بۆ گەیشتن بە دەسەلات )**

حیزبی بەعس سیستەمی تۆتالیتاری وەك میتۆدێکی تری دیکتاتۆرانە بۆ گەیشتن بە دەسەلات و پاراستنی بەکار دەهێنا. هەموو سیستەمێکی لەم جۆرە چەندین ئامرازی جۆراوجۆر بەکار دەهێنن بۆ مانەوەیان لەسەر دەسەلات. ئەو حیزب و سیستەمە هەرچیەك بێت بۆ بەشەرعیەت کردنی پێوانەیەك لە ڕەزامەندی گەل هەمیشەو بەردەوام پێویستە[٦٦]. سمیر الخلیل لەو باوەڕەدایە کە "ڕاگرتنی سەقامگیری سیاسی حیزبی بەعس بەر لەهەر شتێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ ئەنجامی گۆڕینی دەوڵەت و کۆمەڵ بەڕێگای ئیرهابی بەردەوام. زەبروزەنگ و ئیرهاب تەنانەت دوای سەقامگیری دەسەلاتیش بۆ کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵ بەدەزگا کراوە بەشێوەیەك کۆمەڵ بەدەگمەن ئیمکانیەتی کاردانەوەی بۆ دەمێنێتەوە"[٦٧]. بەڵام حیزب و سیستەمە تۆتالیتێرەکانیش نەگۆڕ نین. دارمانی حیزب و سیستەمی سیاسی بەعسی ژێر دەسەلاتی سەدام حسێن بە ڕوونی نیشانیدا گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسیەکانی ئەو ٣٥ ساڵەی عێراقی بەعس بێئەنجام و بێکاریگەر نەبوو بۆ سەر ڕژێمی بەعس. لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستیە ئەو پرسیارە دێتە پێش سەرەڕای هەموو ئەو گۆڕانکاریانە چۆن حیزبی بەعس توانی کۆمەڵ و دەوڵەت بۆ مەودایەکی

---

[66]) Hans Ritscher, Welt der Politik, Berlin, S. 3.

[67]) Samir al Khalil, Republic of Fear, Los Angeles, 1989, zitiert nach Ibrahim, Staat und Gesellschaft im Irak unter der Herrschaft der Baath-Partei, in: Zeitschrift für Politik und Ökonomie in der Dritten Welt, Nr. 42, Münster, 1991, S. 20.).

ئەوەندە دوور کۆنترۆڵ بکات و مانەوەو فەرمانڕەوایی ڕژێمە سیاسیەکەش بتوانێ بپارێزێت. لێرەدا مێژووی سیاسی بەسوودە لە لایەن ڕۆشنبیران و مێژوناسان و حیزب و سیستەمە سیاسیەکان هەڵبسەنگێندرین و وانەی لێوەرگیرێن.

## (هێشتنەوەی دەوڵەتەکانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی)

فاکتەرێکی تر کە حیزب و سیستەمە دەسەلاتدارەکانی بۆنمونە لە کوێت ، عێراق ، سوریا ، یان لە دەوڵەتانێکی تری ناوچەکە ڕاگرتوە بریتیە لە هێشتنەوەی ئەو دەوڵەتانەی لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی لە لایەن هێزە کۆلۆنیالیستەکانەوە دروستکران. هەموو گۆڕانێك بەسەر پێکهاتەی ئەم دەوڵەتە دروستکراوانەدا دەکرێ ئەنجامی پێشبین نەکراو لەگەل خۆیدا بهێنێت[٦٨] . هەر دوو زلهێزی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا تەبابوون لەسەر هێشتنەوەی ئەم سنورە جوگرافیە دەستکردانەی دەوڵەتانی ناوچەکەو بۆ ئەم مەبەستە پشتگیریان بۆنمونە لە سوریاو عێراقیش کردو حیزبێکی وەك ئەوەی بەعسیش سوودی لێوەرگرت بۆ مانەوەی دەوڵەت و دەسەلات و سەقامگیرکردنی سیاسی حیزب و ڕژێمەکەی بەڵام خەباتی گەلانی بەزۆر لکێندراو بەم دەوڵەتانەوە بۆ ئازادی و سەربەخۆیی ئەم پێکهاتە جوگرافیە دەستکردانەی خستۆتە ژێر پرسیارەوە.

[68]) Samir al Khalil, Republic of Fear, S. 18.

# بەشی پێنجەم
# ئۆپۆزسیۆنی سیاسی

## باسی یەکەم
## ئۆپۆزسیۆن وەك چەمك و زاراوە

ئەم بەشەی تەرخانکراوە بۆ باس لە ئۆپۆزسیۆن زۆرتر مەبەست لە ئۆپۆزسیۆنە وەك حیزب و ڕۆڵی لەسەر سیستەمی سیاسی و ئەرك و وەزیفەکانی.

ئۆپۆزسیۆن مانای دژایەتی کردن یان بەرهەڵستکاری دەبەخشێت و لە واتا بەربلاوەکەیدا بریتیە لە هەول و کۆششی سەندیکاو حیزبەکان یان دەستەوگروپ و کەسان بۆ گەیشتن بە هەندێ ئامانجی دژ بە ویستی دەسەلاتدارانی سیاسی ، ئابوری و کۆمەڵایەتی بە کەڵك وەرگرتن لە شێوازی پەرلەمانیی یان هەر شێوازێکی دیکە[٦٩] . ئۆپۆزسیۆن بریتیە لە ڕوبەڕووبونەوە لەنێوان دوو ئۆبجەکتدا کە جیاوازی هەبێت لە نێوانیانداو هەر ئەمەشە کە ململانێ و پێشبرکێ دروستدەکات.

وشەی ئۆپۆزسیۆن لە بنەمادا دەگەڕێتەوە بۆ (oposition) ی لاتینی بەواتای ڕوبەڕوبونەوەو بەرامبەر وەستان ، یان ڕای پێچەوانە دێت کە سەرەتا لە بواری ئەستێرەناسی بەکار دەهات بەڵام دواتر هاتە ناو بوارەکانی دیکە بە تایبەت

٦٩) ئازاد وەلەد دبەگی ، فەرهەنگی ڕامیاری نیگا ، هەولێر ، ٢٠٠٥ ، ل. ٣٣

بواری سیاسەت. هەروەك لە زمانی فەرەنسیشدا بەواتای ڕەخنەگرتن و ناڕازیبوون یان بەرگری دێت. بە هەمان شێوە لە زمانی ئینگلیزی بەواتای بەرخۆدان و ڕوبەڕوبونەوە یان ناڕازیبوون و ڕێگری دێت. لە زمانی عەرەبیدا ئۆپۆزسیۆن سیٚ مانا لەخۆ دەگرێت:

١) پێشبڕکیٚ و ململانیٚ (المسابقە و التنافس).

٢) ناڕەزایی و ڕێگریکردن (المنع و الاعتراض ).

٣) ڕوبەڕوبونەوە لە نێوان دوو شت یان کۆمەڵە شتێك کە جیاوازی لە نێوانیان هەبێت.

لە مەسەلەی سەرهەڵدان و گەشەکردنی ئۆپۆزسیۆن چ لە ناو ، چەمك و چ لە کرۆك و ناوەڕۆکدا دەبەسترێتەوە بە خۆرئاواوەو وەك داهێنراوێکی دنیای خۆرئاوا دادەنرێت. بەتایبەت خەڵکان و نوسەرانی دنیای پاشکەوتو و جیهانی ئیسلامی بە گشتی ڕۆڵێکی نەگەتیڤی بۆ دادەتاشن و بە کۆمەڵێك لێکدانەوەو ئەرکەوە دەیبەستنەوە کە دوور و نزیك پەیوەندی بە ئۆپۆزسیۆنەوە نیە.

تێگەیشتن لە چەمکی ئۆپۆزسیۆن لە سیستەمێکەوە بۆ یەکێکی دی جیاوازە ، هەروەك لە ڕەهەندی زەمەنیشەوە ئەم تێگەیشتنە جیاوازی بە خۆیەوە دەبینێت هەروەها لە ئامرازەکان ، هۆکارەکان و ئامانجەکانی ئۆپۆزسیۆن. هەروەها جیاوازی کاراکتەرە بنەڕەتیەکانی کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەوەی کە ئۆپۆزسیۆنێکی ڕاستەقینەو کاراو تەندروست بێت یان نامۆو داخراو و پەراوێز لە ئەندێشەی تاك و خواستەکانی کۆمەڵ[٧٠].

٧٠) بەختیار جەبار شاوەیس ، ئۆپۆزسیۆن لە چەمکەوە بۆ ئەرك ، سلێمانی، ٢٠١١ ، ل. ٦.

## باسی دووەم

## ئۆپۆزسیۆن لە سیستەمی سیاسیدا

لە باسی حیزبدا دەکرێت مەبەست لە حیزبی دەسەلاتدار بەڵام حیزبی ئۆپۆزسیۆنیش بێت ، مەبەست لە دەستەواژەی حیزبە بەگشتی. هەموو ئەوانە وەك حیزب کۆمەڵە خەسڵەتێکی هاوبەش دەیانگرێتەوە. ئاشکرایە بوونی ئۆپۆزسیۆن لەناو هەر سیستەمێکی سیاسیدا یەکێکە لە پێوەرەکانی دیموکراتی.

"ئامانجی هەر ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسی جا لەهەر شوێن و زەمەنێکدا بێت گەیشتنە بە دەسەلات"[٧١]. ئۆپۆزسیۆنی پەرلەمانیی هەن کە باوەڕیان بە دەستوری ولات هەیەو بەپێی یاساو ڕێساکان لە پەڕلەماندا کاری ئۆپۆزسیۆنیی ڕادەپەرێنن ... ئۆپۆزسیۆنیش هەن کە بەتەواوی سیستەم و دەسەلاتی بەڕێوەبردن ڕەتدەکەنەوەو داوای گۆڕینی دەکەن. ئۆپۆزسیۆنی شاراوەش هەیە لەنێو سیستەمە دیکتاتۆرو شمولیەکاندا ، ئەو دەسەلاتانەی فرەحیزبی ڕەتدەکەنەوەو ئۆپۆزسیۆنیش بەنهێنی کارەکانیان ڕادەپەرێنن[٧٢]. هەندێکجار واپێویست دەکات ئۆپۆزسیۆن هەر بەتەنیا سەرقاڵی دەسەلات نەبێت بەڵکو بایەخی زۆریش بە کۆمەڵگا بدات ، ئەو کاتەی کە دەسەلات هەڕەشەیە بەسەر کۆمەڵگاشەوە. ئۆپۆزسیۆنی فەرمیی نوێنەرایەتی ئەو بەشەی کۆمەڵ دەکات لەنێو پەڕلەمان کە حیزبی براوە نایکات چونکە حیزبێك هەرگیز ناتوانێ بۆ

(٧١) عەبدول ئیلاه بەلقزیز ، ئۆپۆزسیۆن و دەسەلات ، و: هەڵکەوت عبدالله، سلێمانی ٢٠٠٤، ل.٨٠.

(٧٢) بەختیار جەبار شاوەیس ، ل. ٢٠.

سەرجەم گەل بدوێ و تەنیا دەتوانێ نوێنەرایەتی بەشێکی بکات. ئۆپۆزسیۆن دەکرێ حیزبێکی سیاسی بێت ، ڕێکخراوە مەدەنیەکان و گروپەکانی فشارو شەقام بەگشتی یان کۆمەلانی خەڵك بێت ، بەڵام جیاوازی نێوانیان ئەوەیە حیزبی سیاسی بەپێچەوانەی گروپی فشار[٧٣] و ڕێکخراوە مەدەنیەکان دەیەوێ

٧٣) گروپی فشار کۆمەڵە کەسێکن کە پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی تایبەت کۆیان دەکاتەوە. ئەو پەیوەندیە یان خەسڵەتێکی هەمیشەیی یان کاتی هەیەو چەشنێکی دیاریکراوی ڕەفتاری کۆمەڵایەتی بەسەر ئەندامەکانیدا دەسەپێنێت. گروپەکانی فشار واتا بوونی کۆمەڵێك تاك لە ڕێکخراوێکی دیاریکراو لەسەر بنەمایەکی هاوبەش و بەرژەوەندیەکی هاوبەش لەپێناو هێنانەدی ئامانجگەلێکی هاوبەش لە چوارچێوەیەکی یاساییدا. لەم پێناسەیەوە دەبینین جیاوازی لەنێوان گروپەکانی فشارو حیزبی سیاسی نیە ، تەنها لە ڕووی ئەوەوە نەبێت کە حیزبی سیاسی هەوڵ دەدات بگات بە دەسەلات ، بەڵام گروپی فشار خوازیاری ئەوە نیە. لەبری ئەوە فشار دەخەنە سەر ئەو دەسەلاتەی کە حیزب پێی دەگات ، واتا فشار دەخەنە سەر دەسەلات. هەندێ ولات هەیە گروپی وەهای تێدایە زۆر کاریگەرترە لە حیزبە سیاسیەکان. بە گەڕانەوە بۆ مێژوو دەبیستین گروپەکانی فشار زۆر جار هەڵگری سیفەتی یاسایی نەبوون ئەوەش بەهۆی دیکتاتۆری دەوڵەتەوە کە ڕێگای بەو گروپانە نەداوە کاری خۆیان ئازادانە ئەنجام بدەن ، ئەمەش وا لەو گروپانە دەکات کاری ژێر زەمینی و نهێنی بکەن یان توندوتیژی بەکاربهێنن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆیان (کۆمەڵێك نوسەر ، حیزبی سیاسی ، و. ئارام ئەمین شوانی ، هەولێر ، ٢٠١١).

کەواتە ڕۆڵی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان (جەماوەریەکان ، مەدەنیەکان) لە سیستەمی سیاسی دیکتاتۆرو تاك دەسەلاتداردا بەراورد ناکرێ لەگەڵ ئەوانەی لە سیستەمە دیموکراتیەکاندا هەن. سەرجەم ڕێکخراوە جەماوەریەکان لە سیستەمی دیکتاتۆردا پێش هەموو شت لە خزمەتی دەسەلات و دەوڵەتدان سەبارەت بەکۆنترۆل کردنی ئەو بەشانەی کۆمەل کە ئەمان بەڕوکەش نوێنەرایەتیان دەکەن. گروپ و ڕیکخراوە کۆمەڵایەتیەکان و فشار لەپال حیزبەکاندا لایەنی گرنگن لە پرۆسەی سیاسیدا. هەروەك حیزبەکان ئەمانیش هەول ئەدەن بەرژەوەندی نیشانبدەن. بەڵام بەپێچەوانەی حیزبە سیاسیەکان هەوڵی گرتنە ئەستۆی لێپرسینەوەی حکومی نادەن بەڵکو داواکاری و بەرژەوەندیەکانیان دەخەنە بەردەم لێپرسراوانی حکومی. هەندێ بەرژەوەندی هەن کە لەنێو حیزبدا بەدی نایەت بەڵکو لەنێو

وەك ڕێكخراوێكی سیاسی بگاتە دەسەلات و پیادەی دەسەلاتی سیاسی بكات. ئۆپۆزسیۆن دەكرێ حیزبی ناو ، یان دەرەوەی پەرلەمان بێت ، بەلاَم ئەوەی ناو پەرلەمان كاریگەرترە[٧٤]. دەبێت جیاوازیەك هەبێت ئۆپۆزسیۆن لە حیزبی دەسەلاتدار جودابكاتەوە ، بۆنمونە بەرنامەی جیاواز لەوەی دەسەلات، سیاسەتی جیاوازو ئایدۆلۆژیای جیاوازو ئالتەرناتیڤی هەبێت ، ئۆپۆزسیۆن وەك ئۆپۆزسیۆن ڕەفتار بكات[٧٥]. ئۆپۆزسیۆنی دەرەوەی پەرلەمان ئەتوانێت بەر لەهەموو شت پشت بە بنەما سەرەكیەكانی ئازادی بیروڕاو ئازادی میدیا ببەستێت بۆئەوەی داواكاریەكانی بە ئاشكرا بخاتە ڕوو. ڕەوتە سیاسیە نوێكان زۆربەی كات دەست بە كارەكانیان دەكەن لە دەرەوەی پەرلەمان و لە سیستەمە فیدرالیەكان بە پەرلەمانەكانی هەرێمدا دەڕۆن و ڕوو ئەدات بگەنە پەرلەمانی ئیتحادی و بگرە هەتا دەگەنە حكومەتی ئیتحادیش. نمونەیەكی ئەم ڕێگایە حیزبی سەوزەكانی ئەلمانیایە كە لە ساڵی ١٩٨٠ دروستبوو، دواتر لە كوالیسیۆنێكدا لەگەڵ سۆشیال دیموكراتەكان لەسالی ١٩٩٨ – ٢٠٠٥ پێكەوە حكومەتی ئیتحادییان پێكهێنا[٧٦].

---

ڕێكخراوە كۆمەلاَیەتیەكاندا بەدەست دەكەوون. شتێكی دەگمەن نیە كە نوێنەرانی گروپە كۆمەلاَیەتیەكان (ڕێكخراوە جەماوەریەكان و فشار) لە هەمان كاتدا سیاسەتمەدار بن و لە پەرلەمان و وەزارەتدا ڕاستەوخۆ خاوەن كاریگەر بن.

[74])Kramm, Lothar: In: Zeitschrift für Politik, 33. Jg., Heft 1, S. 33 - 43

[75]) Peter Lösche: Opposition und oppositionelles Verhalten in den Vereinigten Staaten. In: ders. (Hrsg.): Göttinger Sozialwissenschaften heute. Göttingen 1990, S. 140.

[76])http://de.wikipedia.org/wiki/Au%C3%9Ferparlamentarische_Opposition.

## باسی سێیەم

## شوێن و زەمەن لە ژیانی ئۆپۆزسیۆندا

تێگەیشتن لە ئۆپۆزسیۆن لە سیستەمێکەوە بۆ یەکێکی دی جیاوازە هەروەك لە ڕەهەندی شوێن و زەمەنیشەوە ئەم تێگەیشتنە جیاوازی بە خۆیەوە دەبینێت[٧٧]. شوێنی کارو چالاکی ئۆپۆزسیۆن لە ولاتێکی دیموکراسیدا ئاشکراو بێترسەو دەشبێتە هۆی گەشەکردن. بەڵام لە ولاتی دیکتاتۆردا ئەوا ئۆپۆزسیۆن دەبێت ڕوو بکاتە خەباتی ژێرزەمینی و قوربانیدان ، بۆنمونە کورد لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا ، یان کورد لە بەشەکانی تری کوردستان. لەو دۆخی سەرکوتکردن و دەستدرێژیکردنەدا ئۆپۆزسیۆن ناچار دەکات ڕێڕەوی دیکەی نائاشتیخوازانەو ناژیوارییانەو توندوتیژی سیاسی بگرێتەبەر[٧٨]. ئۆپۆزسیۆن بە پێچەوانەی سیستەمە دیکتاتۆرەکان و سیستەمە تەقلیدی و شمولیەکان تەنیا لە سیستەمی دیموکراسیدا دەتوانێت بە ئازادی کاربکات و تەندروستانە گەشەبکات. لە ڕەهەندی زەمەنیشەوە بۆی بڕوانین و لەسەر نمونەی کورد دەمێنمەوە لە عێراق لە سەردەمی جەنگی سارددا سیاسەتی هەردوو بلۆکی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا لە بەرژەوەندی حیزب و دەوڵەتی بەعسدا بوو. هەربۆیە سیاسەتی دەرەوەی ئەو دوو بلۆکە دژ بە بەرژەوەندیەکانی کورد لە عێراق گەڕایەوە وەك ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسی. پەیوەندی ڕاستەقینەی یەکێتی سۆڤیەت تەنیا بەدەوڵەتانەوە بوو نەك بە بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکانەوە تەنانەت بە کۆمۆنیستەکانیشەوە. کورد لەناو ئەم دەڵەتەی عێراقدا وەك هێزێکی ئۆپۆزسیۆن لە شوێن و زەمەنێکی هەڵەدا دەژیا.

---

٧٧) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ، ل. ٧.

٧٨) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە عەبدول ئیلاه بەلقزیز ، ئۆپۆزسیۆن و دەسەلات ، ل. ١٩.

## باسی چوارەم

## هاوپەیمانیی نێوان ئۆپۆزسیۆن و دەسەلات

ڕوو ئەدات لەکاتی قەیرانی گەورەدا پرس و ئاسایشی نەتەوەیی بکەوێتە مەترسیەوە وەك قەیرانی ئابوری گەورە یان هێرشی دەرەکی سەربازی بۆ سەر ولات. بارودۆخێك پێویستی بە هەماهەنگی دەسەلات و ئۆپۆزسیۆن هەیە. سروشتی ئەم هەماهەنگی و هاوپەیمانێتیەش بەندە بە سروشتی سیاسی نێوان ئەو دوو لایەنەو هەڵوێستی گەل لەسەری. هەروەك چۆن قۆناغ هەیە ئۆپۆزسیۆنەکان پێکەوە دەبەستێتەوە ، هەربەم شێوەیە قۆناغیش هەیە ئۆپۆزسیۆن و دەسەلاتیش پێکەوە دەبەستێتەوە بەڵام هەمیشە جیاوازیەکانی نێوان دەسەلات و ئۆپۆزسیۆن دەبێت دیاربن. کوالیسیۆنی گەورە ئاسایی ئەوەی نێوان حیزبە گەورەکانی پەرلەمانە کە زۆرایەتی پەرلەمانیان هەیە ئیتر لەسەر ئاستی هەرێم یان لەسەر ئاستی دەولەتی ئیتحادی بێت. بۆنمونە کوالیسیۆنی گەورەی حیزبە جەماوەریەکانی CDU/CSU و SPD (حیزبی یەکێتی مەسیحیە دیموکراتەکان و سۆشیال دیموکراتەکان) لە ئەلمانیا لەسەر ئاستی ئیتحاد دەگمەنە. یەکەم کوالیسیۆنی گەورە لە ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٦٦– ١٩٦٩ بوو. دوەم کوالیسیۆن لە ٢٢,١١,٢٠٠٥ بوو لە کاتی حکومەتەکەی CDU [٧٩] ، بەواتا لە جەنگی دوەمی جیهانیەوە تەنیا دوو جار کوالیسیۆنی گەورەی نێوانی حیزبی دەسەلات و ئۆپۆزسیۆن لە ئەڵمانیادا هەبووە[٨٠].

[79])de.wikipedia.org/wiki/Koalitionsregierungen_in_Deutschland.

[80]) Kramm, Lothar: Grundzüge einer Theorie der politischen Opposition. In: Zeitschrift für Politik, 33.Jg., Heft 1)1986, S. 33 - 43

## باسی پێنجەم

## کاریگەریی کەلتوری سیاسی لەسەر حیزب و ئۆپۆزسیۆن

یەکێك لە کێشەکانی سیاسەت و کۆمەڵ بریتیە لە دواکەوتویی کەلتوری سیاسی بۆ بەها دیموکراتیەکان. تەنانەت لە هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا (جگە لە دەوڵەتی ئیسرائیل / تاڕادەیەك) دیموکراسیەت تەنیا ڕوکەش بووەو ئۆپۆزسیۆنی سیاسیش بەواتا هاوچەرخەکەی بەدی ناکرێت. عبدول ئیلاە بەلقیز ئاماژە بە چوار هۆکار ئەدات سەبارەت بە گەشە نەکردنی ئۆپۆزسیۆن لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا کە بریتین لە: شکستی سیاسی ، دۆگمای فیکری، نامۆبوون بە گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگاو داخرانی ڕێکخراوەیی. لەم کۆمەڵگایانەدا دەسەلاتدارە تەقلیدیەکان هەرگیز ئامادە نەبوون دەستبەرداری دەسەلات بن ، ئەوەش بەزیان گەڕاوەتەوە بۆ ئۆپۆزسیۆنیش. لەبەر ڕۆشنایی دواکەوتویی کۆمەڵ بەگشتی و کەلتورە سیاسیەکە هەربۆیە ئۆپۆزسیۆنەکان لەو ولاتانە ئۆپۆزسیۆنێکی هاوچەرخ نین و هەموو بە دەسەلاتیشەوە بەرهەمی واقعی کۆمەڵگاکەی خۆیانن ، هەربۆیە پەڕینەوە بۆ کۆمەڵگایەکی مۆدێرن کارێکی ئاسان نیەو پرۆسەیەکی ئالۆزو درێژخایەنە[٨١].

81) Max Weber, Wirtschaft und Gesellschaft, Tübingen, 1980, S. 551.

# بەشی شەشەم
# حیزب لە سیستەمی سیاسی ئەڵمانیادا

## باسی یەکەم
## حیزبە سیاسیەکانی ئەڵمانیا

ئەڵمانیا وەك دەوڵەتێکی پەرلەمانیی دیموکراتی پیادەی سیستەمێکی سیاسی پلورالیستی و فرەیی دەکات. هەر چوار ساڵ جارێك حیزب هەڵدەبژێردرێت بۆ پێکهێنانی پەرلەمان لەسەر ئاستی هەرێمەکان و ئیتحاددا.

لەکاتی یەکەم هەڵبژاردنەکانی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٤٩ ، دوای جەنگی دوەمی جیهانی یازدە حیزب گەیشتنە یەکەم پەرلەمانی ئەڵمانیا. ڕێژەی دانانی ٥٪ وەك مەرجی چوونە نێو پەرلەمان لەساڵی ١٩٥٣ بۆ یەکەمجار دانراو کاری پێکرا. حیزبەکانی FDP، CDU/CSU, SPD لەم هەڵبژاردنەدا زیاتر لە ٧٠٪ی دەنگەکانیان بەدەستهێنا. لە ساڵی ١٩٥٢ حیزبی ئیمپراتۆری سۆشیالیستی (حیزبێکی ڕادیکالی ڕاستڕەو) قەدەغەکرا. ئەوە یەکەم حیزب بوو قەدەغە بکرێت لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا دوای جەنگی دوەمی جیهانی. هەروەها لە ساڵی ١٩٥٦ حیزبی شیۆعی ئەڵمانی (KPD) قەدەغەکرا. هەتا کۆتایی هەشتاکان حیزبەکانی FDP،CDU/CSU, SPD بالادەستبوون بەسەر سیستەمی سیاسی ئەڵمانیای ئیتحادیی. لە ١٩٦١وە لەم حیزبانە زیاتر هیچ حیزبێکی تر بوونی نەبوو لە پەرلەماندا. لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان لە ساڵی ١٩٧٢ -

١٩٧٦ توانییان تەنانەت ٩٩٪ی سەرجەم دەنگەکان بەلای خۆیاندا کۆبکەنەوە[٨٢].

دوای بڕیاری کۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی ئیتحادی ئەڵمانیا لە بەرواری ١٧,٧,٢٠٠٩ تەنیا بەشداریکردنی ٢٩ حیزب ڕێگا پێدران بۆ هەڵبژاردنی هەرێمەکان بۆ ساڵی ٢٠٠٩ ، بەڵام ٢٧ حیزب توانییان بچنە پرۆسەی هەڵبژاردنەوە. ژمارەی ڕێکخراو ، و حیزبەکانی ئەڵمانیا[٨٣] هەتا بەرواری ساڵی ٢٠١٠ بریتی بووە لە ٨٧ حیزب و ڕێکخراوی سیاسی، بەڵام لەم ژمارەیە تەنیا ١٧ حیزب و ڕێکخراو بودجەو پشتگیریی دارایی دەوڵەتیان پێدراوە چونکە مەرجە یاساییەکانیان تێدا

[82](www.bpb.de/.../KR1MEJ,0,0,Das_Parteiensystem_der_BRD_und_sei.)

٨٣) بەپێی دەستوری ئەڵمانیا شێوازی دەولەت کۆماری ، پەرلەمانی ، ئیتحادیە. شێوازی حکومەت پەرلەمانیی دیموکراتیە. ئەڵمانیا شێوازی فیدرالی پیادە دەکات. ئەڵمانیا خاوەنی دانیشتوانێکی ٨٣ ملیۆن کەسە (حەوت ملیۆن بێگانە ، زۆرینەی تورك) چڕترین ناوچەی جێنشینە لە جیهاندا. ڕوبەری دەوڵەتی ئەڵمانیا بریتیە لە ٣٥٧,١١١,٩١ کم دوجا. چڕیی دانیشتوان ٢٢٩ کەس بۆ هەر یەك کم دوجا. ئەم دەوڵەتە کەوتۆتە ناوەڕاستی ئەوروپاو لە ١٦ هەرێمی فیدرالی پێکهاتوە. ئەلمانیا سنوری بە نۆ دەوڵەتی ئەوروپی هاوسێ هەیە کە بریتین لە (نەمسا، چیك، سلۆڤاکیا، سویسرا، ئیتالیا، فەرەنسا، هۆڵەندا، بەلجیکا، پۆلۆنیا). سنوری بە دەریای باکورو دەریای ڕۆژهەلات هەیەو لە باشوریش بە شاخەکانی ئالپ. ئەندامی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانە ، هاوپەیمانی ئەتڵەسی ، بازاری ئەوروپی هاوبەش و ئەندامی هەشت دەوڵەتە پیشەسازیە گەورەکەیە. بەپێوانەی دەخلی قەومی ، ئەڵمانیا گەورەترین ئابوری ئەوروپایەو چوارەم گەورەترینی جیهانە. لە سالی ٢٠٠٩ دوەم گەورەترین دەوڵەت بوو لە هەناردەو سێیەم گەورەترینە لە هاوردەدا. سێیەم دەوڵەتە لە جیهاندا لە هەناردەی چەك. بەرلین پایتەختەو ئەڵمانی زمانی فەرمیە (de.wikipedia.org/wiki/Deutschland).

هەبووە. ئەو ژمارە حیزبانە بۆ دانیشتوانێکی ۸۳ ملیۆن کەس و ژمارەی پەرلەمانێکی ئیتحادی کە بریتیە لە ٦٢٢ ئەندام.

ئەگەر بڕوانینە قۆناغە جیاوازەکانی مێژووی سیاسی ئەڵمانیا لە دوایساڵی ۱۹٤۸ەوە ئەبینین کە بۆ هەر قۆناغێك کۆمەڵە حیزبێك هەبووە کە ناو ، وە ناوەڕۆکیان بەندبووە بەو قۆناغە سیاسی و مێژویی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و کەلتوریەوە کە تێیدا ژیاون، بەواتا شوێن و زەمەن و قۆناغی مێژویی و سروشتی ئەو کۆمەڵگایە گرنگیی خۆی هەیە بۆ پرۆسە جیاوازەکانی ژیان ، حیزب و سیاسەتیش لەگەڵیدا[٨٤].

لە ڕۆژئاوای ئەڵمانیا حیزبەکانی (یەکێتی دیموکراتی مەسیحی / یەکێتی کۆمەڵایەتی مەسیحی) CSU/CDU هەروەها SPD (سۆشیال دیموکراتەکان) لەسەر ئاستی هەرێمەکان هەریەکەو بەگشتی لانی کەم ۳۰٪ دەنگەکانیان هەیە. لەکاتێکدا لیبەراڵەکان و سەوزەکان (FDP، Bündnis 90/Die Grünen) و چەپەکان هەندێك لەسەرو ڕێژەی ٥٪ یان هەیە ، ئەمە وەك ڕێژەو مەرجی چوونە نێو پەرلەمانەوە (هەرێم و ئیتحاد). لە هەرێمەکانی باکوری ڕۆژهەلاتی ئەڵمانیا (ئەلمانیای ڕۆژهەلاتی سەردەمی جەنگی سارد) سیستەمێکی حیزبیی سێ لایەنە دروستبوە لە (یەکێتی دیموکراتی مەسیحی، سۆشیال دیموکراتەکان و حیزبی چەپەکان) ( SPD, CDU، Linkspartei). ڕێژەی زۆرینەی ئەم حیزبانە لە سالانی ۱۹۹۰ وە (دوای کۆتایی جەنگی ساردو ڕوخانی دیوارەکەی بەرلین و یەکگرتنەوەی ئەلمانیا) هەتا ئەمڕۆش بەردەوام لەبەرزونزمیدایە. هەروەها ئەندامبوون و بەندبوونی هەڵبژێردەر بە حیزبەوە بەگشتی ڕووی

[84]) Reinhard Kühn, Welt der Politik, 1991, S. 37.

لەکزی کردووە. حیزبی CSUی هەرێمی باڤاریاو CDU لە هەرێمەکانی تر کە لەسەر ئاستی ئیتحاد توند پێکەوە کاردەکەن هەردوو ئەم حیزبانە وەك SPD خۆیان بە حیزبی جەماوەری دادەنێن چونکە لەسەر ئاستی سەرجەم ئەڵمانیا ئەندام و جەماوەرو هەڵبژێردەریان هەیەو خۆیان لە چەپەکان و ڕاسترەوە توندڕەوەکان جودا دەکەنەوە. SPD (سۆشیال دیموکراتەکانی ئەلمانیا) خۆی بە نوێنەری کرێکاران و توێژی ناوەڕاست دادەنێ و نزیکن لە سەندیکاکانەوە، بەڵام لە ڕاستیدا بە دوو زمان دەدوێن. بە زمانێك خۆیان وەك نوێنەری کرێکاران و سەندیکاکان دەناسێنن ، بەڵام بە زمانەکەی تر نوێنەری سەرمایەدارە گەورەکانیش دەکەن. حیزبەکانی ( FDP, Die Linke، Bündnis 90/Die Grünen) لە هەڵبژێردەرانێکی باریکەوە هاتوون. ئەم سێ حیزبە بەردەوام لە هەڵبژاردنەکاندا لەبەردەم گرفتی ڕێژەی لە ٥٪دان. لەگەڵ ئەوەشدا لە سیستەمی حیزبدا لە ئەڵمانیا حیزبە بچوکەکان هێزی سیاسین کە بۆ حیزبە گەورەکان فاکتەری دروستبونی هاوپەیمانین بۆ حوکمرانی. بۆنمونە FDP (لیبەرالەکا)ن خۆی وەك حیزبێکی لیبرال دیموکرات پێناسە دەکات و نزیکە لە CDU بۆ هاوپەیمانیەت. سەوزەکان (Bündnis 90/Die Grünen) خۆیان لە بابەتەکانی ژینگەو هەروەها بزوتنەوەی ئاشتی و دژە ئەتۆم و بواری دەوڵەتی کۆمەڵایەتی دەبیننەوەو زۆرتر لەگەڵ سۆشیال دیموکراتەکان هاوپەیمانی پێك دەهێنن. لێرەدا جیاوازی نێوان ئەم جۆرە حیزبە بچوکانەی ئاماژەم پێدان لە ئەڵمانیاو هاوشێوەکانی لەسەر ئاستی بەرنامەو ئایدۆلۆژیا دەبینرێن. FDP وGrüne (لیبەرالەکان و سەوزەکان) لە هەرێمە نوێکاندا (ئەوانەی ڕۆژهەلاتی ئەڵمانیا) ڕۆلی گرنگیان نیە. چەپەکان دەتوانرێ وەك حیزبی جەماوەریی لە هەرێمەکانی باکوری ڕۆژهەلات (ڕۆژهەلاتی ئەڵمانیا) ببینرێت و لەم هەرێمانە خۆی وەك ئالتەرناتیڤێکی دیموکرات سۆسیالیست بەرامبەر بە SPD نیشان ئەدات. سەرچاوەی هەڵبژێردەرانی حیزبی چەپەکان

بە شێوەیەکی سەرەکی لە ڕۆژهەلاتی ئەڵمانیایەو لە ڕۆژئاواش لە هەندێك لە هەرێمەکان لە گەشەکردندایە بەڵام توانیویانە بچنە ناو پەرلەمانی ئیتحادیەوە[٨٥]. حیزب لە سیستەمی سیاسی ئەڵمانیادا ڕۆڵی سەقامگیرکەرو بەشەرعی کردن دەبینێت. هەڵبژاردن و ژمارەی دەنگەکانی هەرێمەکان کاریگەری و گرنگیی خۆی هەیە بۆ سەر دەسەلاتی ناوەندو بۆ سەر سیستەمی سیاسی دەوڵەت بەگشتی. هەروەها لەسەر پێکهاتەی سیاسی و قورسایی لە بوندسرات[٨٦] (ئەنجومەنی فیدرالی)[٨٧]. حیزب لە بنەڕەتدا کە ئامرازی گوزارشت کردنە لە بیروبۆچونەکانی کۆمەڵ ، لە ئەڵمانیا بەپێی یاسای هەڵبژاردن هەر چوار ساڵ جارێك دەچنە هەڵبژاردنەوە بە ئامانجی گەیشتن بە پەرلەمان (هەرێمەکان / ئیتحاد).

هەتا ساڵی ١٩٨٣ حیزبەکانی نوێنەر لە پەرلەمانی ئەڵمانیا (بوندستاگ) هەمان ئەو حیزبانە بوون بۆ یەکەم پەرلەمان هەڵبژێردران لە ساڵی ١٩٤٩ کە بریتین لە حیزبەکانی یەکێتی مەسیحیە دیموکراتەکان (CDU) ، سۆشیال دیموکراتەکان (SPD) ، و لیبەراڵەکان (FDP) هەروەها یەکێتی کۆمەڵایەتی مەسیحی (CSU)ی هەرێمی باڤاریا (بایەرن) کە خوشکە حیزبی (CDU)،ە و پێکەوە بۆ هەڵبژاردنەکان دادەبەزن. ئەم دوو حیزبە دەگەڕێنەوە بۆ خێزانی حیزبە ئەورووپیە مەسیحیەکانی نوێنەر لە سەرجەم ئەڵمانیا. سۆشیال دیموکراتەکان

[85] de.wikipedia.org/wiki/Politisches_System_Deutschlands.

٨٦) بوندسرات (ئەنجومەنی هەرێمەکان) ئۆرگانێکی دەستوریە، لە ٢٣,٥,١٩٤٩ پێکهێنرا، بارەگای سەرەکی لە بەرلینی پایتەختە.

[87] Hans Boldt, Nordrein-Westfalen, Bonn, 2009, S.105.

(SPD) دووەم گەورەترین حیزبی سیاسی ئەڵمانیایەو دەگەڕێتەوە بۆ خێزانی حیزبە دیموکراسیە کۆمەڵایەتیەکان و دیموکراسیە سۆشیالیستەکانی ئەوروپا.

زۆرن ژمارەی حیزبە سیاسیەکان لە ئەڵمانیا بەڵام شەش حیزبی سەرەکی لە ئێستادا گۆڕەپانی سیاسی ئەڵمانیایان داگیرکردوە ، ئەوانەش بریتین لە:
DIE LINKE, BUNDNIS 90/Die ، SPD ، CSU ، FDP ، CDU)
GRÜNEN). بەڵام بەهێزترینی ئەم حیزبانە بریتین لە SPD لەگەل CDU بەڵام رێژەی هێزو زۆریی جەماوەری ئەم حیزبانە لە هەرێمەکان وەك یەك نین و جیاوازن. لە هەرێمی Bayern حیزبی CSU بەهێزترینە بەڵام بوونی تەنیا لەم یەك هەرێمەدایە.

گرنگیی حیزب لێرەدا لە بەرنامەکەیدایە کە ڕەنگدانەوەی ئایدۆلۆژیایە. بۆنمونە هەردوو حیزبی CDU/CSU گوزارشت لە بەرژەوەندیەکانی کارگەو خاوەن سەرمایە گەورەکان دەکەن. SPD (سۆشیال دیموکراتەکان) بە حیزبێك دادەنرێ کە نزیکە لە سەندیکا کرێکاریەکانەوە بەڵام خۆی بە نوێنەری توێژی ناوەڕاستیش دەزانێت. بەڵام لیبەراڵەکان (FDP) حیزبی دیموکراتی ئازاد نوێنەری مەبدەئی تەدەخول کردنی دەوڵەتە لەسەر ژیانی ئازادیی بازاڕ ئەوەندەی لەتوانادا بێت. بەشێوەیەکی سەرەکی نوێنەری بەرژەوەندیەکانی خاوەن موچە بەرزەکان و چین و توێژە ڕۆشنبیرەکانە[٨٨]. حیزبی سەوزەکان و حیزبی چەپ یەکەم حیزبن لەدوای ساڵی ١٩٤٩ بەشێوەیەکی سەرکەوتوو دروستبوەو بەردەوامە لە ژیانی سیاسیدا. ئەوەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ خێزانی حیزبە سەوزەکانی ژینگەی ئەوروپا. لە خەسڵەتی ئەم حیزبە بانگهێش

---

٨٨) هەمان سەرچاوە ، ل. ١٠٧.

کردنە بۆ پێکەوە گرێدان لە نێوان مەبدەئی ئابوری بازاڕو لە نێوان چاودێریی دەوڵەت لەسەر سروشت و ژینگە.[٨٩]

لە ساڵی ١٩٨٩ لە هەناوی حیزبی شیوعی (SED)ی کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی (ئەڵمانیای ڕۆهەلات) حیزبی PDS دروستبوو. سەرکەوتنەکانی زۆرتر لە هەرێمە نوێیەکانی ڕۆژهەلاتی ئەڵمانیا[٩٠] کۆبۆوە. ئەم حیزبە دواتر لەگەڵ بەشێك لە باڵی چەپی سۆشیال دیموکراتەکان یەکیان گرتوو لە ساڵی ٢٠٠٧ بوونە حیزبی چەپ ، دی لینکە (Die Linke)[٩١] بەڵام بە جیاوازیەوە لەگەڵ فکرو بەرنامەی پێشودا. لێرەدا دەبینین حیزب خاوەن بەرنامەو

٨٩) سەوزەکان ئەو تەنیا حیزبە سیاسیەیە داوای لابردنی کورەی وزە ئەتۆمیەکانی کردوە لە ئەڵمانیاو لە شوێنیدا ئالتەرناتیڤی تر بەکار بهێنرێت. ئێستە دوای ڕوداوەکەی فوکۆشیما لە یابان حکومەتی ئەڵمانیا بڕیاریدا هەتا ساڵی ٢٠٢٢ کورەی وزە ئەتۆمیەکان لابرێت و ئالتەرناتیڤی تر دەخرێتە شوێنی.

٩٠) ئەڵمانیای ڕۆژهەلات دوای جەنگی دوەمی جیهانی و لە ئەنجامی دابەشبوونی ئەڵمانیا بەسەر هەردوو بەرەی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات ئەم بەشەی ئەڵمانیا خرایە ژێر دەسەلاتی یەکێتی سۆڤیەت. جگە لە حیزبی یەکێتی سۆشیالیستی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات (SED) کە لە ساڵی ١٩٤٩ لە بەزۆر یەکپێگرتنی حیزبی سۆشیال دیموکراتەکان و حیزبی شیوعی ئەڵمانیا پێکهات چیتر ڕێگا بە دروستبونی حیزبی تری ئازاد نەدرا. دوای یەکگرتنەوەی هەردوو بەشەکەی ئەڵمانیاو ڕوخانی دیوارەکەی بەرلین لە دوای کۆتایی جەنگی سارد چەندین حیزب و ڕێکخراوی سیاسی تر لەو بەشەی ڕۆژهەلاتی ئەلمانیا دروستبوون. هەندێك لەمانە دوای دابەشبوونی ئەڵمانیا بەنهێنی دروستبوون لە بەشی ڕۆژهەلات ، دوای یەکگرتنەوەکەی ئەڵمانیا ناوەکانی خۆیان گۆڕی و (١٣) حیزبی سیاسی لەم بەشەی ئەڵمانیا چالاك بوون ، لە تەنیشت ئەمانە (١٣) حیزبی تری بچووك دروستبوون کە بەشێکیان هەر ماوون.

91) http://www.almaniya-iraq.org.

ئایدۆلۆژیایە. هەربۆیە بۆچونێکی بێ لۆجیکە حیزبێك بتوانێت سەرجەم چین و توێژە کۆمەڵایەتیەکان بە بۆچوون و بەرژەوەندیە جیاوازەکانیانەوە بۆ فکرو سیاسەت و ئابوری لەنێو یەك حیزبدا کۆبکاتەوە.




نەخشەی ئەڵمانیا و هاوسێکانی / نەخشەی ژمارە ١



**وێنەی ژمارە ١ ، پەڕلەمانی ئەڵمانیای ئیتحادی**

## باسی دووەم

## حیزبی چەپی ئەڵمانیا لە هەرێمی زارلاند

لە دوو باسدا لێکۆڵینەوەیەکی کەمم ئەنجامداوە لەسەر هەردوو حیزبی چەپ و سەوزەکان وەك دوو حیزبی نوێ بەبەراورد بە هێزە سیاسیە گەورەکانی دوای جەنگی دوەمی جیهانی لە ئەڵمانیا بۆ تێگەیشتن لەو گۆڕانە سیاسیانەی لەسەر گۆڕەپانی حیزبدا هاتۆتە پێش. لە هەرێمێکی وەك Saarland [٩٢] سێ حیزب لە هاوپەیمانیەتێکدا فەرمانڕەوایی دەکەن کە بریتین لە:

[٩٢]) ناوچەی زارلاند ، ئەو ناوچەیەی کە دوای ساڵی ١٩٥٧ بووە هەرێمێکی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا. زارلاند دوای جەنگی دوەمی جیهانی لە ١٩٤٥ – ١,١,١٩٥٧ ناوچەیەکی سەربەخۆ بوو بەڵام لەژێر دەسەلاتی فەرەنسا. لەم بارودۆخەی زارلاند دوای ساڵی ١٩٤٥ چەندین حیزبی سەربەخۆ دروستبوون. لەم هەرێمە لە ساڵی ١٩٥٥ ڕێگا بە حیزبی کەش درابوو کە کاریان بۆ یەکگرتنەوەی ئەم ناوچە ئەڵمانە دەکرد لەگەڵ ئەڵمانیای ئیتحادیدا. ژمارەی حیزب لەم ناوچەیە بۆ ئەو قۆناغە میژوییە بریتی بوو لە ١٠.

BUNDNIS 90/Die Grünen،CDU, FDP . لەم هەرێمە حیزبی حیزبی چەپ بە سەرۆکایەتی ئۆسکار لافۆنتێن لە هەڵبژاردنی هەرێمەکەدا لە ۲۰۰۹ بۆ یەکەمجار بەشداریی هەڵبژاردنیان کردو ۲۲ کورسی پەرلەمانیان بەدەستهێنا کە دیاردەو گۆڕانێکی نوێی سیاسیە لە مێژووی هەرێمەکەو ئەڵمانیاش. ئۆسکار لافۆنتێن لەباڵی چەپی حیزبی سۆشیال دیموکراتەکان بوو. بۆ ماوەیەك چەندین پۆستی جۆراوجۆری هەبوو. دواپۆستی بریتی بوو لە وەزیری دارایی. دواتر حیزبەکەی جێهێشت و لەگەڵ هێزێکی تری سیاسی چەپ کە لە هەناوی ڕۆژهەلاتی ئەڵمانیا سەریهەڵدا ، بریتی بوو لە PDS. لە ١٦,٦,٢٠٠٩ حیزبێکی نوێی سیاسیان پێکهێنا کە دەنگی پێویستیان هێنا بۆچوونە ناو پەرلەمانی ئیتحادی لە شاری بەرلینی پایتەخت. لە هەرێمەکاندا کاراکتەری حیزبێکی هەرێمییان هەیەو لەسەر ئاستی کۆمونەکان پۆستی بالایان هەیە. حیزبی چەپ تەنیا لە دوو هەرێم بەشدارن لە حکومەتدا (پێکەوە لەگەڵ سۆشیال دیموکراتەکان) کە بریتین لە هەردوو هەرێمی بەرلینی پایتەخت و براندنبورگ لە ڕۆژهەلاتی ئەڵمانیا. چەپەکان لە هەڵبژاردنی ٢٢,٩,٢٠١٣ بوونە سێیەم هێزی سیاسی لەو پێنج فراکسیۆنەی نێو پەرلەمانی ئیتحادی لە ئەڵمانیا. لە کۆی 622 کورسی نێو پەرلەمانی ئیتحادی ٦٢ کورسی بەر حیزبی چەپ دەکەوێت. حیزبی چەپەکان لەسەر ئاستی ئەوروپا ئەندامی بەرەی چەپەکانی ئەوروپان.







خشتەی ژمارە 2




**دەنگە براوەو دۆڕاوەکانی هەڵبژاردن لە هەرێمی زارلاند ۲۰۱۲**

**خشتەی ژمارە 3**

لە خشتەی ژمارە ۳ ڕێژەی دەنگە براوەو دۆڕاوەکان لە هەڵبژاردنی هەرێمی زارلاند / ۲۰۱۲ دەبینرێت. لە بەراوردی نێوان دوو خشتەکەدا دەبینری چەپەکان و لیبەراڵەکان دەنگیان دۆڕاندووە ئەم دەنگانەش بە پلەی یەکەم بۆ سۆشیال دیموکراتەکان و هەروەها بۆ حیزبێکی نوێ (پیراتەکان) ڕۆیشتوە. ئەم

حیزبە نوێیەی پیراتەکان لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠١١ لە هەرێمی بەرلینی پایتەختیش بۆ یەکەمجار چۆتە هەڵبژاردنەوەو توانیویەتی ٩٪ی دەنگەکان بە دەستبهێنێت. ئەم دیاردە نوێیەی پیراتەکان و حیزبی چەپەکان هەروەها لە هەشتاکانیشەوە حیزبی سەوزەکان ئەو پەیامە نیشان ئەدات کە حیزبی نوێ دروستبوون و لە قورسایی حیزبەکانی سەردەمی دووەم جەنگی جیهانی بەدواوە کەمدەکەنەوە.

ڕێژەی دەنگەکانی هەرێمی زارلاند ، سالانی
2009 / 2004 ، بڕوانە ڕێژەی دەنگەکانی حیزبی چەپ

| | حیزبەکان | 2009 | 2004 |
|---|---|---|---|
| ئەنجامی هەڵبژاردنەکان لەسەر ئاستی هەرێم | CDU | 34.5 | 47.6 |
| | SPD | 24.5 | 30.8 |
| | Bü. 90 / Grüne | 5.9 | 5.6 |
| | FDP | 7.4 | 5.2 |
| | Linke / PDS | 21.3 | 2.3 |
| | NPD | 1.5 | 4.0 |
| | Familie | 2.0 | 3.0 |

**خشتەی ژمارە 4**

http://www.wahlrecht.de/ergebnisse/saarland.htm

لە خشتەی ژمارە ٤ دا ڕێژەی دەنگەکانی حیزبەکانی هەرێمەکە دەردەکەوێ بۆ سالانی ٢٠٠٤ / ٢٠٠٩. ئەوەی جێگای سەرنج ڕاکێشە بریتیە لە حیزبی چەپ. لە ساڵی ٢٠٠٤ حیزبی ناوبراو تەنیا ٢,٣ ٪ دەنگی هێناوە لە کاتێکدا لە ٢٠٠٩ ڕێژەی دەنگەکانی گەیشتۆتە ٢١,٣٪ بەڵام لەدوا هەڵبژاردنی ٢٠١٢ گەڕاوەتەوە بۆ ١٦,١ (بڕوانە خشتەی ژمارە ٢، ٤).

## باسی سێیەم

## حیزبی سەوزەکانی ئەڵمانیا

بەهێزترینی فراکسیۆنی حیزبی سەوزەکان بریتیە لە ٢٠٪ی دەنگەکان لە پەڕلەمانەکانی هەرێمی (Sachsen-Anhal), (Brandenburg), ( ), (Sachsen) (Thüringen) کە کەوتونەتە ڕۆژهەلاتی ئەڵمانیا.[٩٣] حیزبی سەوزەکان کە ژمارەی ئەندامانی بەپێی ئاماری مانگی ٢٠١٢/٤ بریتیە لە 59.210 هەزار ئەندام ، لە سێ هەرێمدا بەشداری دەسەلاتەو لەناو پەڕلەمانی ئیتحادیدا چەند ساڵێك لەگەڵ سۆشیال دیموکراتەکان بەشداربوون لە حکومەتدا. حیزبی سەوزەکان بەپێچەوانەی حیزبی چەپەکان ڕەگی سیاسی و مێژویی و کۆمەڵایەتیان لە ڕۆژئاوای ئەڵمانیایە. ناوەڕۆکی سیاسییان بواری ژینگەو کۆمەڵایەتی و ئابوریە. حیزبی سەوزەکان جەماوەری هەڵبژێردەریان بەپلەی یەکەم لەناو چین و توێژەکانی ناو شارەکاندان بەتایبەتی لەناو توێژی گەنجان و خاوەن پیشە بەرزەکان بەتایبەت لە هەرێمەکانی وەك (بەرلین و هامبورگ و برێمن) کە زۆربەی کات لە ڕیزی دوەمی ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ئەم هەرێمانەدا بوون و چەند جارێك بەشداربوون لە حکومەتی هەرێمەکانیدا. لە چەند ناوچەیەکی تریشدا پێگەیان هەیە بەتایبەت لە هەرێمەکانی (بادن ڤورتمبێرگ و هێسن) هەروەها ماوەیەکە لە هەرێمی (شلێسڤیگ هۆڵشتاین) و بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە هەرێمەکانی (نیدەرزاکسن و بایەرن) لە گەشەکردندان. شارە زانکۆییەکانی وەك (فرایبورگ ، برایسگاو ، کۆنستانتس و تیوبینگن) پارێزگارەکانیان لە حیزبی سەوزەکانن بەڵام بە پێچەوانەوە لە دێهاتەکاندا دەنگی کەمیان هەیە. کێشەی سەوزەکان لە هەرێمەکانی ڕۆژهەلاتدایە (ئەلمانیای ڕۆژهەلات). لە هەڵبژاردنی پەڕلەمانی ئیتحادیی ساڵی ٢٠٠٥

---

[93]) de.wikipedia.org/wiki/Die_Linke.

سەوزەکان ١٤٠ هەزار دەنگیان لە سۆشیال دیموکراتەکان بردەوە بەڵام ٢٤٠ هەزار دەنگدەری سەوزەکان پەڕینەوە بۆ چەپەکان و ٧٠ هەزار دەنگیشیان پەڕینەوە بۆ بەرەی دەنگ نەدەرەکان. بە پێچەوانەی هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٩ لە ساڵی ٢٠٠٥ دا سەوزەکان ١٣٠ هەزار دەنگی بۆ بەرژەوەندی CDU لە دەستدا[٩٤].

لە هەڵبژاردنی پەڕلەمانی ئیتحادی لە ساڵی ٢٠٠٩ گۆڕانێك لە ڕێژەی هەڵبژێردەراندا بەدیکرا. لێرەدا ٨٧ هەزار لە هەڵبژێردەرەکانی حیزبی سۆشیال دیموکراتەکان پەڕینەوە بۆ لای سەوزەکان. بە پێچەوانەشەوە سەوزەکان ١٤٠ هەزار دەنگیان لەدەستدا بۆ بەرژەوەندی حیزبی چەپەکان و ٣٠ هەزار دەنگی تریشیان لەدەستدا بۆ گروپی دەنگنەدەر. ڕێژەی گواستنەوەی ژمارەی دەنگدەران لە حیزبە ڕاستڕەوەکانەوە بۆ حیزبە ڕاستڕەوەکانی تر زۆر کەمتر بوو. لەکاتێکدا ٥٠ هەزار دەنگی CDU پەڕییەوە بۆ سەوزەکان بەڵام ٣٠ هەزار دەنگدەر لە سەوزەکانیش پەڕییەوە بۆ حیزبی لیبەراڵەکان (FDP).

سەرجەم هەرێمەکان سیستەمی فرەپارتایەتیان هەیەو خاوەن پلورالیزمی سیاسین. حیزبە پەپولیستەکان نەتەنیا لە هەرێمێکدا بەڵکو لەسەر ئاستی ناوەندیشدا دەردەکەون و جگە لە ڕێکخراوە هەرێمیەکانیان ڕێکخراوی ئیتحادی ناوەندیشیان هەیەو لە هەڵبژاردنی ئیتحاددا لەسەر ئاستی سەرجەم دەوڵەت دەنگ دەهێنن. حیزبی سنورداری هەرێمیی لەئەڵمانیا تەنیا لە CSU دا هەیە لە هەرێمی باڤاریا کە دیاردەیەکی زۆر شازە ، وەك پێشتر ئاماژەم پێداوە بەهۆی هاوپەیمانێتیەوە لەگەڵ حیزبی CDU کاریگەریی هەیە لەسەر ئاستی ناوەند.

[94]) de.wikipedia.org/wiki/Bündnis_90/Die_Grünen.

## باسی چوارەم

## ئایدۆلۆژیای حیزبی نازی و کاریگەری لەسەر سیستەمی سیاسی

نازیەت ڕژێم و حیزبێکی ڕادیکالی دژە یەهود ، دژە کۆمۆنیزم و دژە دیموکرات و دژە ئاین و بزوتنەوەیەکی سیاسی فاشی تۆتالیتێرەو نوێنەرایەتی ئەم جیهانبینیە دەکات. ناسیۆنالیزم و ڕاسیزم لە خەسلەتەکانی ئەم سیستەمەیە. فکری نازی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی لە ئەڵمانیا دروستبوو. ئەو کۆمەڵگا نوێیەی کە سیستەمی تۆتالیتێر دروستیدەکات دەلکێندرێت بە دیکتاتۆریەتی تۆتالیتێرەوەو دەخرێتە ناو ئەو بازنەیەوە کە لەلایەن (کارل فریدریش، CARL J. FRIEDRICH) ڕیزبەندی کراوە بە شەش خاڵی بڕیاردەر: (ئایدۆلۆژیا) (تاك حیزبی جەماوەریی) (سیستەمێکی تیرۆر) (مۆنۆپۆل کردنی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن) (کۆنترۆل کردنی سوپا لەلایەن حیزب) (ئابوریەکی ناوەندیی قیادەکراو)[٩٥] .

٩٥) بە بیروڕای نوسەری ئەڵمانی (CARL J. FRIEDRICH) شەش فاکتەر هەن کە سەرجەم کۆمەڵگاو سیستەمە سیاسیە تۆتالیتێرەکانی هاوچەرخ هاوبەش هەیانە:

١) ئایدۆلۆژیایەکی ڕەسمی کە لەلایەن سیستەمە تۆتالیتێرەکەوە شەرعیەتی دراوەتیّ کە سەرجەم بەشەکانی ژیانی مرۆڤەکان بگرێتەوە. لەناوبردنی بەکۆمەڵی یەهودیەکان لەلایەن نازیەکانەوە پاڵپێوەنەری ئایدۆلۆژیشی هەیە. هیتلەر ڕەگەزی ئاری بە ڕەگەزێکی تایبەت و پاك دادەنا کە گوایە لەسەرو هەموو ڕەگەزەکانی ترەوەیە. تۆتالیتاریزم بەرگری لە دەسەلاتەکەی بەڕێگای ئایدۆلۆژیاوە دەکات. حیزبی تۆتالیتێر لەو ئامانجە دروستبوە ئەهدافەکانی ئایدۆلۆژیا بەدی بهێنێت. لێرەدا ئایدۆلۆژیا بۆ حیزب دوو واتایە: بۆ ئامانجی شەرعیەتدان و وەك ئامرازی دەسەلات.

٢) مۆنۆپۆلی حیزب: لەلایەن تاك حیزبی جەماوەریی فەرمانڕەوایی بكرێ. لێرەدا تەنیا یەك حیزبی سیاسی بوونی هەیە كە سەرجەم سیاسەتی گرتۆتە چنگی خۆی و بڕیارەكان بەتەنیا ئەنجام ئەدات. نە لەناو ، وە نە لە دەرەوەی حیزب ئۆپۆزسیۆنی قبولٚ نیە. لەبەر ڕۆشنایی قەدەغەكردنی تەكەتولات بەتەنیا سەرووی حیزب فەرمان دەردەكات. حیزب لەژێر دەسەلاتی تەنیا یەك سەركردەدا دەبێت، كە بە شێوەیەكی هیراكی و هەڕەمی و ئۆلیگارشی ڕێكخراوە. دەسەلات و فەرمانڕەوایەتیەكە مەركەزیەو ڕێگا نادرێت بە هیچ شێوازێكی دەستوری و هەڵبژاردن دەسەلاتیان لێبسەندرێتەوە. ئەم دەسەلاتە كۆنترۆڵی هەر سێ دەسەلاتە سەرەكیەكانی دەوڵەت دەكات كە بریتین لە دەسەلاتی (یاسادانان و جێبەجێكردن و دادوەری).

٣) مۆنۆپۆلٚ و كۆنترۆلی تەواوی ئامرازەكانی جەنگ لە دەستی حیزب و كادرەكانی بیرۆكراتی ژێر دەسەلاتی حیزب و سوپادایە.

٤) مۆنۆپۆل و كۆنترۆلٚ كردنی موتڵەقی حیزب بەسەر سەرجەم ئامرازەكانی ڕاگەیاندنداو سەركردایەتی كردنی.

٥) سیستەمی تیرۆر لەسەر بنەمای فیزیكی و دەرونی كە لەلایەن حیزب و پۆلیسی نهێنیەوە كۆنترۆل و پراكتیزە دەكرێ. حیزبیش بۆ سەركردەكەی نەك هەر چاودێر بەڵكو دژایەتی دوژمنانی ڕژێم دەكات و سەركوتی ڕاپەڕینی عەفەوی دانیشتوان دەكات و تیرۆری سیستێماتیك دژ بەو لایەنانەی كە بە نەیاری ڕژێم ناو دەبرێن و هەروەها دژ بەو گروپە كۆمەڵایەتیانەی كە عەفەوی دروستدەبن. ئەوەی ببێتە ئۆپۆزیسۆن ئەوا شوناسی دوژمنی سیستەمەكەی ئەدرێتێ و دەبێت لەناو ببرێت. ئازادی لەم سیستەمەدا لەناو دەبرێت چونكە ئازادی بنچینەی سەرەكی هەر سیستەمێكی سیاسیە ئەگەر بیەوێ بەرەو دیكتاتۆریەت و تۆتالیتاریزم گەشە نەكات. لەم سیستەمەدا ئیحتیكاری ڕێكخراوەیی هەیە ، ڕێكخراو و گروپی ئاوتۆنۆم نیە. گشت ئەمانە لەژێر كۆنترۆڵی حیزبدان. حیزب شێوە ئەدات بە گروپەكان و بەڕێوەیان دەبات بەجۆرێك كە گشت مرۆڤەكان چەند جارێك چاودێری دەكرێن بۆنمونە سەندیكاو ڕێكخراوە پیشەییەكان ، بە جۆرێك كە كەسی تاك وەك تاك ، نەك وەك گروپ هەمیشە ڕوبەڕووی بەرەی داخراوی حیزب و ئایدۆلۆژیاكەی دەبێتەوە كە ئەم بەرامبەری بێدەسەلاتەو لەم دیدو جیهانبینیەوە دەبێت هەرواش بمێنێتەوە. ڕێكخستن لە سیستەمی

سیستەمە سیاسیە دیکتاتۆری و تەقلیدیەکان ئامانجیانە کە کۆمەڵ قبوڵیان بکات و دەسەلاتیان نەخەنە بەر مەترسی. بەشێوەیەکی وورد دەست خستنە ناو ژیانی کۆمەڵ و تاکە کەسەوەو دروستکردنی کۆمەڵگایەکی نوێ و گۆڕینی ئەو کۆمەڵە کۆنە بەنوێ ئامانجی سەرەکی سیستەمە دیکتاتۆریە تەقلیدیەکان نەبوە ، بەڵام نەهێشتنی تەواوی ئازادی مەبەستی تەواوی دەسەلاتی تۆتالیتاریزمە. لێرەدا ڕێگا نادرێت بەشی کۆنترۆڵ نەکراو هەبێت چونکە بوونی هەر بۆشاییەك لەم بۆچونەوە دەبێت ببێتە دروستکردنی مەترسی بۆ دەسەلاتی تۆتالیتێر. حیزب و سیستەمی سیاسی تۆتالیتێر سیستەمی سیاسی تاك حیزبەو سەرجەم دەسەلاتی سیاسی لەدەستی تاك حیزبێکدا چەق دەگرێ و تووشی کێشەی کێبرکێ نابێتەوە لەسەر کورسی دەسەلات بەڵام ئەوەش ناگەیەنێت ئەم سیستەمە نەگۆڕ نەبێت. بە پێچەوانەی دەسەلاتی دیکتاتۆرەوە دەسەلاتی تۆتالیتاریزم نەك بەتەنیا دوژمنەکانی بەڵکو دۆستەکانیشی لەناو دەبات بۆنمونە کوشتنی سەرکردە بۆلشەڤیکەکان لە لایەن ستالین. هاوڵاتیانی دەوڵەتی تۆتالیتێر ڕوبەڕوی کۆنترۆڵی هەمیشەیی بونەتەوە بەڕێگای دامودەزگا سیخوری و هەواڵگریەکانیەوەو هەروەها ئیرهابی بێسەروبەر بۆ گرتن و بەندکردنی خەڵکیی بە شێوەیەکی هەڕەمەکی.

---

تۆتالیتێردا خەسڵەتی خۆی هەیە بەڵام لەم بوارەدا تاك و کۆمەل و گروپە کۆمەڵایەتیەکان سەربەخۆیی خۆیان وون دەکەن لەبەر ئەوەی ڕێکخستن لەسەر ڕۆشنایی جیهانبینی سیستەمی تۆتالیتێر دادەنرێ ئەمیش بە نەخشەی مەرکەزیی ئەنجام ئەدرێ.

٦) CARL J. FRIEDRICH باس لە فاکتەرێکی تری تۆتالیتاریزم دەکات کە بریتیە لە چاودێریی کردن و سەرکردایەتی کردنی مەرکەزیی ئابوری لەلایەن دەوڵەت و حیزبەوە.

## باسی پێنجەم

## حیزبی نازی ئەڵمانی ، میتۆدەکانی گەیشتنی بە دەسەلات

لە باسی حیزبی نازیدا گرنگە ئەم خالانەی خوارەوە لەبەرچاو بگیرێن:

- ئایدۆلۆژیای حیزب.
- ڕۆڵی فاشیزم لە ئەڵمانیا ، هۆکارەکانی گەیشتنی بەدەسەلات و کاریگەریی لەسەر گۆڕینی سیستەمی سیاسی ئەڵمانیا لە کۆماری ڤایمارەوە بۆ سیستەمێکی فاشی تۆتالیتێر.
- ڕوخانی حیزبی نازییش ئەو ڕاستیەی نیشاندا کە هیچ سیستەمێکی سیاسی نەگۆڕ نیە.
- لە دەرئەنجامی ڕوخانی فاشیزم سیستەمێکی تری سیاسی دیموکراتی نوێ لە ڕۆژئاوای ئەڵمانیا هاتە کایەوە ، بەڵام سیستەمێکی سیاسی تاك حیزبی تۆتالیتێریش لە ڕۆژهەلاتی ئەڵمانیا دروستبوو.

بەرنامەی حیزبی نازی لەپاڵ ئەلەمەنتی ناسیۆنالیستی و دژە کۆمۆنیزم و ڕاسیزم و دژە زیمیتیزم (دژە یەهود) داواکاریی چین و توێژی کۆمەڵیشی خستبوە بەرنامەوە کەخۆیان دژ بە گەورە سەرمایەکان گوزارشت دەکرد ، بەڵام بەزۆری ڕویان کردبوە سەرمایەداری یەهود. بەم شێوەیە توانرا ناڕەزایی توێژی ناوەڕاست بەدیوی دژ بە یەهود پێچ پێبکرێتەوە بۆ بەرژەوەندی سیستەمەکە. جیاوازی حیزبی نازی لەگەڵ پارتە ڕاستڕەوەکانی تردا لە میتۆدە سیاسیەکانیشدا خۆی دەردەخست. بۆنمونە نازیەکان وای بۆدەچوون کە

باشترین ڕێگا بۆ دژایەتی کردنی کۆمۆنیستەکان لە دژە ئایدۆلۆژیادایە، لەوەی نازیەکان کرێکاران بەلای خۆیاندا ڕابکێشن و بزوتنەوەی کرێکاریی دژ بەکۆمۆنیستەکان ڕێکبخرێت و مۆبیلیزە بکرێ. ڕژێمی نازی هەر لە سەرەتاوە کاری بۆ جەنگ دەکرد بۆ ئامانجی داگیرکردنی دەرەوەو فراوانکردنی ئەڵمانیاو دەوڵەمەندکردنی دەوڵەتەکەی و دەسەلاتە شمولیەکەی بە ڕێگای ناشەرعیەوە. بەواتا جەنگ بۆ درێژەپێدانی سیاسەت بە شێوەیەکی ترو سەرقاڵ کردنی جەماوەریش بەشوێنی ترەوە. هەمان شت بەرنامەی ئۆکۆنۆمیستەکان (ئیقتیسادیەکان) و سەربازیەکانیش بوو کە بۆ ئەم مەبەستە پشتگیری و هاوکاری حیزبی نازییان دەکرد. پڕۆژەو تەندەرە ئابوریە گەورەکان ئەدرانە کەسان و کارگە گەورەو قورسەکان لەسەر ئاستی وەلاو پەیوەندی و پشتگیری بۆ حیزب و سەرۆك و لەسەر ئەم پرەنسیپە دابەش دەکران[٩٦]. ئەو ئامرازانە چیبوون کە حیزبێکی وەك ئەوەی نازی ، یان وەك حیزبی بەعس بتوانێ بگاتە دەسەلات و دواتر چەمکی دەسەلات بەو توندیە بەردەوام بگرێتە دەست و ببێتە حیزب و دەسەلاتێکی تۆتالیتێرو بتوانێت سەرەڕای ئەو هەموو قەیرانە سیاسی و ئابوریە زۆرەش کە لەسالانی فەرمانڕەوایەتیاندا ڕوبەڕویان بۆتەوە زەمەنێکی درێژ لەسەر دەسەلات بمێننەوە؟ پێش ئەوەی نازیەکانی ئەڵمانیا (الحزب الاشتراکی القومی) بە سەرۆکایەتی ئەدۆلف هیتلەر بگات بە دەسەلاتی سیاسی ، قەیرانی ئابوری و بێکاری و هەڵئاوسانی دارایی بەهۆی حکومەتی ڤایمارەوە لەئارادا بوو کە ناو ئەڵمانیای گرتبۆوە. بە پلەی یەکەم فاکتەرە

[96] ) Faschismus; Ursachen und Politik des deutschen Faschismus, S. 4.

سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوریەکان بوون زەمینەی گەیشتنی نازیەتیان دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بە دەسەلات گەیاند. ئەم فاکتەرانەی خوارەوە بارگرانی بوون بەسەر کۆماری ڤایمارەوە هەر لە دروستبونیەوە:

• قەیران و هەڵئاوسانی ئابوری و داچوونی موچەو بێکاری بەکۆمەڵ. ئەم دیاردانە لەسەر هێزە ڕاسترەو، وە چەپڕەوەکان کاریگەربوون کە دیموکراسیەتی پەرلەمانییان ڕەد دەکردەوە، بێزێییان پێدەکردو بێسەقامگیریان دەکرد.

• حکومەتە بێتوانا ناسەقامگیرەکانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی قەیرانە ئابوریەکانیان لە ئەڵمانیا لەکاتی خۆیدا وەك پێویست سەرکردایەتی نەدەکرد بەڵکو بەشێکیشی خراپترکرد.

• بێتوانایی هێزە دیموکرات و لیبەرالەکان لەسەر کردارو بەرنامەی هاوبەش دژ بە نازیەکان[٩٧].

نازیەکان بێتوانایی حکومەتی ئەو کاتەی کۆماری ڤایماریان سەبارەت بە نەتوانینی چارەسەر کردنی گەندەڵی و قەیرانە ئابوریەکانی ناو ولاتیان قۆستەوە بەلای خۆیانداو حیزبی نازی بەسوود وەرگرتن لەو قەیرانە توانی دوای ساڵی ١٩١٨ (دوای جەنگی یەکەمی جیهانی) وەك یەکێك لە گروپە زۆر ناسیۆنالیستەکان خۆیان لە شاری میۆنیخی ئەڵمانیا دروستبکەن. لە سالانی قەیرانە ئابوریە گەورەکەدا ١٩٢٩ – ١٩٣٢ حیزبی نازی توانی بە پشتگیری

[97]) rg/wiki/Zeit_des_Nationalsozialismus.

کارگە پیشەسازیە گەورەکان ببێتە بزوتنەوەیەکی جەماوەریی. وەك بەرەیەکی گوایە خەڵکانی سادە حیزبی ئیشتراکی قەومیی ئەڵمانی (نازی) دەرکەوت و بنکە کۆمەڵایەتیەکەی سەرەتاو بەشێوەیەکی سەرەکی لەناو جوتیارانی قەرزدارو توێژی ناوەڕاست و لە بەشێکی کرێکارانی پیشەسازی و کرێکارانی کشتوکاڵی دروستکرد[٩٨]. ئەم حیزبە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٢٨ ، لە ٢,٦٪ دەنگەکانی هێنا. لەساڵی ١٩٣٠ ، ١٨,٣٪ ، دواتر لە ساڵی ١٩٣٢، ٣٧,٤٪ دەنگی بەدەست هێنا[٩٩]. ئایا چۆن حیزبێکی لەم جۆرە توانی بەم شێوەیە گەشە بکات و ببێتە ئەو هێزە گەورەیەو بووە هۆی هەڵگیرسانی جەنگێکی جیهانیی. حیزبێك لە کەشێکی دیموکراتیدا هەوڵی بەدەستهێنانی دەنگ بدات کە خۆی بڕوای بە دیموکراسیەت نەبێت و بۆ ئەو ئامانجە بێت بەم ڕێگایەوە بەهێزبێت و دواتر کۆتایی بە کەش و هەوای سیستەمی پەڕلەمەنتاری کۆماری ڤایمار بهێنێت و سیستەمێکی تۆتالیتاری دابمەزرێنێ و بەشێکی گەورەی کۆمەلانی خەڵکیش پەسەندی بکەن. لە قۆناغی نازیەتدا ، ساڵی ١٩٣٣ – ١٩٤٥ وەك حیزب و سیستەمێکی تۆتالیتێر ڕێگا بە دروستبونی هیچ حیزبێکی سیاسی تر نەدرا.

98 ) Faschismus; Ursachen und Politik des deutschen Faschismus, S.6.

٩٩) هەمان سەرچاوە ، ل. ٦.

# بەشی حەوتەم
# ڕۆڵ و کاریگەریی حیزب لە ئەنجومەنی فیدرالی ئەڵمانیا

ئەنجومەنی نوێنەرانی (پەرلەمانی) ئەڵمانیا بە پێی ماددەی ٥١ی دەستور لە دوو پێکهاتە دروستبووە کە بریتین لە (پەرلەمانی ئیتحادی) لەگەڵ (ئەنجومەنی فیدرالی).

قورسایی ئەنجومەنی فیدرالی لە قەوارەی دەسەلاتدا بەتایبەت بەرامبەر پەرلەمان و حکومەتی ئیتحاد بەندە بە ڕێژەی چەندایەتی و دەنگی حیزبی سیاسیەوە لە ناوەند (ئیتحاد) لەلایەکەوە ، لە هەرێمەکان لەلایەکی ترەوە ، بەوە (ئەنجومەنی هەرێمەکان/ ئەنجومەنی فیدرالی) دەکەوێتە ژێر گۆڕانی بەردەوام. بەم شێوەیە ڕێژەی زۆرایەتی دەنگ و کورسی حیزبی سیاسی لە هەرێمەکاندا کاریگەرییان لەسەر دەسەلات و سیستەمی سیاسی و ئەنجومەنی فیدرالی هەیە. ئەم ئۆرگانە دەستوریە (ئەنجومەنی فیدرالی) و ئەندامەکانی لەلایەن گەلەوە هەڵنەبژێردراوە وەك ئەندامەکانی پەرلەمان بەڵکو سەر بە حکومەتی هەرێمەکانن. بۆنمونە ئەگەر هەرێمێك لەلایەن سۆشیال دیموکراتەکان فەرمانڕەوایی بکرێت ئەوا نوێنەری ئەم حیزبە دەنێردرێتە ئەنجومەنی هەرێمەکان / ئەنجومەنی فیدرالی. ئەم ئۆرگانەش بەشێوەی خۆی بەشداری بڕیارە لەو یاسایانەی حکومەتی ئیتحاد (سەرۆك وەزیران و کابینەکەی) دەری دەکات. ئەنجومەنی فیدرالی دەتوانێت ڕەشنوس ڕەد بکاتەوە یان تێهەڵچونەوە بکات چونکە هەندێ یاسا پێویستییان بەڕەزامەندی ئەم ئۆرگانە دەستوریەش هەیە. سەرۆکی ئەنجومەنی فیدرالی لە هەمان کاتدا جێگری سەرۆك کۆمارە[١٠٠].

[100]) http://de.wikipedia.org/wiki/Bundesrat_(Deutschland).

تەنیا ئەوانە دەبنە ئەندامی ئەنجومەنی فیدرالی کە دەنگیان لە حکومەتی هەرێمدا هەیە. ئەوانەش بریتین لە سەرۆکی حکومەتی هەرێم ، وەزیری هەرێم ، پارێزگارو سیناتۆرەکان هەروەها سکرتێرەکانی دەوڵەتیش دەتوانن بچنە ناو ئەنجومەنی فیدرالیەوە بەڵام ئەوەندەی پلەی کابینەیان هەبێت. هەموو هەرێمێك تەنیا دەتوانێت ئەوەندە ئەندامی لە ئەنجومەنی فیدرالی هەبێت بەقەد دەنگەکانی. ئەندامەکانی تری حکومەتی هەرێم دەتوانرێت وەك ئەندامی جێگر دابنرێن. هەر هەرێمێك خۆی بڕیار ئەدات کێ دەبێتە ئەندام یان جێگر لە ئەنجومەنی فیدرالی. ژمارەی دەنگەکانی هەر هەرێمێك بەپێی ژمارەی دانیشتوانەکەی ڕەچاو دەکرێت (بڕوانە خشتەی ژمارە 5) ، لانی کەم سێ دەنگی هەیە. هەرێمەکانی کە ژمارەی دانیشتوانی زیاتر لەدوو ملیۆنە چوار دەنگی هەیە. پتر لە شەش ملیۆن کەس پێنج دەنگی هەیە. پتر لە حەوت ملیۆن ، شەش دەنگی هەیە لە ئەنجومەنی هەرێمەکان بەواتا لە ئەنجومەنی فیدرالی.

ژمارەی دەنگەکان لە ئەنجومەنی فیدرالی بریتین لە ٦٩ دەنگ. بۆ بڕیارەکان پێویست بە ٣٥ دەنگ دەکات. تەنیا بە ٢/٣ی زۆرایەتی ئەندامەکانی ئەنجومەنی فیدرالی بەپێی ماددەی ٧٩ی دەستور دەتوانرێ گۆڕانکاری لە دەستوری ئەڵمانیادا بکرێ. ئەوەش لانی کەم بریتی دەبێت لە ٤٦ دەنگ. هەرێمە بچوکەکان بە بەراورد لەگەڵ هەرێمەکانی تردا قورسایی لە دەنگدا وەردەگرن بەڵام بێئەوەی بتوانن دەنگی خۆیان بەسەر هەرێمەکانی تردا زاڵ بکەن. ئەندام بوون لە ئەنجومەنی فیدرالی پێگەی هەرێمەکان بەهێز دەکات. چوار گەورەترین هەرێم هەریەکەو شەش دەنگی هەیەو بەم پێیە پێکەوە لە توانایاندا هەیە لەبەردەم گۆڕینی دەستوری بنەڕەتیی کە ٢/٣ ی زۆرایەتی دەوێت ببنە کەمایەتیەکی بەربەست بەڵام بەتەنیا زۆرایەتی کۆی دەنگەکان پێك ناهێنن بۆ بڕیارو وەستانەوە دژی یان بەرامبەر هەرێمەکانی تر[١٠١] .

(١٠١) هەمان سەرچاوەی سەرەوە.

| ژمارەی دەنگەکانی هەرێمەکان لە ئەنجومەنی فیدرالی. ژمارەی دانیشتوان / حیزبە فەرمانڕەواکان لە هەرێمەکانی ئەڵمانیا ، ناوی هەرێمەکان | | | |
|---|---|---|---|
| هەرێم | دانیشتوان / ملیۆن | ژمارەی دەنگەکان لە ئەنجومەنی فیدرالی (69 ئەندام) | حیزبە حکومیەکان |
| Baden-Württemberg | 10.749.506 | 6 | CDU und FDP |
| Bayern | 12.519.728 | 6 | CSU und FDP |
| Berlin | 3.431.675 | 4 | SPD und DIE LINKE. |
| Brandenburg | 2.522.493 | 4 | SPD und DIE LINKE. |
| Bremen | 661.866 | 3 | SPD und B'90/Die Grünen |
| Hamburg | 1.772.100 | 3 | CDU und GAL (Grüne) |
| Hessen | 6.064.953 | 5 | CDU und FDP |
| Mecklenburg-Vorpommern | 1.664.356 | 3 | SPD und CDU |
| Niedersachsen | 7.947.244 | 6 | CDU und FDP |
| Nordrhein-Westfalen | 17.933.064 | 6 | SPD und B'90/Die Grünen |
| Rheinland-Pfalz | 4.028.351 | 4 | SPD |
| Saarland | 1.030.324 | 3 | CDU, FDP und B'90/Die Grünen |
| Sachsen | 4.192.801 | 4 | CDU und FDP |
| Sachsen-Anhalt | 2.381.872 | 4 | CDU und SPD |
| Schleswig-Holstein | 2.834.260 | 4 | CDU und FDP |
| Thüringen | 2.267.763 | 4 | CDU und SPD |

**خشتەی ژمارە 5**

„http://de.wikipedia.org/wiki/Bundesrat_(Deutschland)“

## سیستەمی سیاسی ئەڵمانیای فیدراڵ ( لەلایەن نوسەرەوە کراوە بەکوردی )




**نەخشەی ژمارە ٢**

# دەرئەنجام

• دیموکراسی هاوچەرخ بێ حیزبی سیاسی مەحاڵە. حیزب کار لەسەر دروستبوونی ئیرادەی سیاسی تاکەکانی کۆمەڵ دەکات ، هەروەها حیزبی سیاسی دەبێت دەزگایەکی ژیانی دەستوری بێت. حیزبی سیاسی ڕەنگدانەوەی واقعی کۆمەلایەتی و ئابوری و فکریی کۆمەڵگاشە.

• حیزب بەندە بە بەشێکی گەل کە بەرژەوەندی تایبەتی هەیەو بۆ بەدیهێنانی ئەم بەرژەوەندیانە ئۆرگانیزە بووە. بەم شێوەیە حیزبێك هەرگیز ناتوانێ بۆ سەرجەم گەل بدوێ چونکە بەپێی پێناسە تەنیا دەتوانێ نوێنەرایەتی بەشێکی بکات ، زۆربەی کات دژ بە بەرژەوەندیەکانی بەشەکانی تری کۆمەڵ (حیزبێکی کرێکاریی خەبات ناکات لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندیەکانی چینێکی بۆرژوازی بەڵکو بەپێچەوانەوە لەدژی دەوەستێتەوە).

• بۆ تاکی کۆمەڵ شتێکی گرانە ئایدیاکانی بەتەنیا خۆی پڕاکتیزە بکات. لەبەر ئەوە بۆ هاوبیرەکانی خۆی دەگەڕێت ، ئەوانەی وەك ئەم بەدوای هەمان ئامانجدا دەگەڕێن. مرۆڤ ئەو حیزبە هەڵدەبژێرێ لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیدا گونجاون (بەرژەوەندیە سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتیەکان).

• حیزب لەژیانی دیموکراسیدا هەڵبژاردن ڕێك دەخات و بەشداریی تێدا دەکات بۆ ئەوەی دەنگ بهێنێت. حیزب لە کاتێکدا هەوڵی بەدەستهێنانی دەنگ و دەسەلات ئەدات ، هەربۆیە گرنگیشە بیروڕای سیاسی گەلیش بخوێنێتەوەو هەروەها بوارو بنەماکانی ژیانی سیاسی ڕوون بکرێنەوەو هەڵوێست دەربارەیان وەربگیرێت ، بەشێوەیەك لەکاتی هەڵبژاردنی گشتیدا توانای بڕیاری سیاسی ڕوون و تەواو بۆ گەل بخولقێندرێت.

• لە سیستەمی سیاسی دیکتاتۆردا دەسەلات لەوەیە ئەنجومەن و دەزگای جۆراوجۆر پێك بهێنێت و وانیشانبدات کە سیستەمە سیاسیەکە دەزگای یاسادانان و دەزگای ڕاپەراندن و دادوەریی هەیە بەڵام لە ڕاستیدا ئەمانە هەموو ئەنجومەن و دەزگای دیکتاتۆرین بۆ چەواشەکردن و پەیڕەوکردنی سیاسەتی دیکتاتۆرانەی خۆی کە حیزبی دیکتاتۆر بەکاریان دەهێنێت. لە سیستەمی تاك حیزبیدا ولات ڕوبەڕووی قۆرخ کردنی دەسەلات و بلاوبونەوەی گەندەڵی و بیرۆکراسیەت دەبێتەوە.

• حیزب ئۆرگانێکی گرنگە بۆ بەمۆدێرن کردن یان پاشخستنی سیستەمی سیاسی. ڕێفۆرم کردنی سیستەمی سیاسی بەر لەهەر شتێك پێویستی بە ڕێفۆرم کردنی حیزب هەیە چونکە حیزب ڕۆلی گرنگ دەبینێت بۆ بە مۆدێرن کردنی سیستەمی سیاسی.

• ئۆپۆزسیۆن پێویستە ڕەخنەگر بێت و کۆنترۆڵ و چاودێریی دەسەلات بکات بۆ هەر لادانێك ئیتر بوارەکانی سیاسی ، ئابوری و کۆمەڵایەتی بێت کە زیان بە ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتیمانی بگەیەنێت. ئۆپۆزسیۆن سەنگەر لە دەسەلات دەگرێت و هەڵەکانی دەقۆزێتەوە بەو ئامانجەی لە هەڵبژاردنی داهاتودا زۆرترین دەنگ بەدەست بهێنێت و بگاتە دەسەلات بۆ ئەوەی بتوانێت بەرنامەکانی خۆی جێبەجێ بکات. ئۆپۆزسیۆن نوێنەرایەتی ئەو بەشەی کۆمەڵ دەکات لەناو پەرلەمان کە حیزبی براوە نایکات چونکە حیزبێك هەرگیز ناتوانێت بۆ سەرجەم گەل بدوێ و تەنیا دەتوانێ نوێنەرایەتی بەشێکی بکات.

• ئۆپۆزسیۆن دەکرێ حیزبێکی سیاسی ناو پەرلەمان ، دەرەوەی پەرلەمان بێت ، یان ڕێکخراوە مەدەنیەکان و گروپەکانی فشارو شەقام و بەگشتی کۆمەلانی خەڵك بێت ، بەڵام جیاوازی نێوانیان ئەوەیە حیزبی سیاسی بە

پێچەوانەی گروپی فشارو ڕێکخراوە مەدەنیەکان دەیەوێ وەك ڕێکخراوێکی سیاسی بگاتە دەسەلات و پیادەی دەسەلاتی سیاسی بکات. هەروەها دەبێت جیاوازیەك هەبێت ئۆپۆزسیۆن لە حیزبی دەسەلاتدار جودابکاتەوە.

• حیزبەکانی ئەڵمانیاو هاوشێوەکانی بە ڕوونی خاوەن فکری سیاسی و بەرنامەی کۆمەڵایەتی و ژینگەو ئابوری خۆیانن کە کاریان پێدەکرێت و وەك پێویستیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری دروستبوون.

• یەکێك لە کێشەکانی سیاسەت و کۆمەڵ بریتیە لە دواکەوتویی کەلتوری سیاسی بۆ بەها دیموکراتیەکان. تەنانەت لە هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا (جگە لە ئیسرائیل تا ڕادەیەك) دیموکراسیەت تەنیا ڕوکەش بووە. دەسەلاتدارە دیکتاتۆرو تەقلیدیەکان هەرگیز ئامادە نەبوون دەستبەرداری دەسەلات بن ، ئەوەش بەزیان گەڕاوەتەوە بۆ ئۆپۆزسیۆنیش. لەبەر ڕۆشنایی دواکەوتویی کۆمەڵ بەگشتی و کەلتورە سیاسیەکە هەربۆیە ئۆپۆزسیۆنەکانیش لەو ولاتانە ئۆپۆزسیۆنێکی هاوچەرخ نین و هەموو بە دەسەلاتیشەوە بەرهەمی واقعی کۆمەڵگاکەی خۆیانن ، هەربۆیە پەڕینەوە بۆ کۆمەڵگایەکی مۆدێرنتر کارێکی ئاسان نیەو پرۆسەیەکی ئالۆزو درێژخایەنە.

• دارایی و بودجە مەسەلەیەکی گرنگە بۆ ڕوناکی خستنە سەر پەیوەندیەکانی حیزب و دەسەلات. حیزب پێویستە سەرچاوەکانی دارایی و دەستکەوتەکانی دیاربن. سەربەخۆیی حیزب باشتر دەپارێزرێت ئەگەر سەرچاوەی دارایی و خەرجی حیزب لەلایەن دەوڵەتی یاساوە بێت و بەشێوەیەکی یاسایی ڕێکخرابێت و بەپێی پێویست بدرێ چونکە ئابوری ولات ئابوری نەتەوەیەو هەربۆیە دەبێت لەلایەن حکومەتەوە دادپەروەرانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ.

دەوڵەت بەم شێوەیە دەتوانێ کۆنترۆڵی دارایی حیزبەکان بکات و داوای دۆسیەی دارایی کراوەشیان لێبکات.

• هەر کۆمەڵگایەك تایبەتمەندی خۆی هەیە. بیروبۆچوونی هەر کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتی دەربارەی دەسەلات و حیزب و سیستەمی سیاسی لەگەڵ ئەویتردا دەگۆڕێ ، ئەویش بەپێی ڕەوشی تایبەتیی هەر کۆمەڵگایەك لە ڕووی مێژوویی و ڕەوشی ئابوری و کۆمەڵایەتی و کەلتوری و جوگرافیاو ئاستی هوشیاریەوە کە هوشیاری سیاسی تاکەکانی کۆمەڵگا دیاری دەکەن.

# سەرچاوەکان

## سەرچاوەکان بە زمانی کوردی


- د. حوجەتولای ئەیوبی ، سەرهەڵدان و بەردەوامی حیزبە سیاسیەکان لە ڕۆژئاوادا.
- شعبان الطاهر الاسود ، كۆمەڵناسی سیاسی ، وەرگێڕانی بۆ کوردی: کۆلێژی زانستە ڕامیاریەکان ، زانکۆی سلێمانی.
- کۆمەڵێك نوسەر ، حیزبی سیاسی ، وەرگێڕانی: ئارام ئەمین شوانی.
- بەهادین ئەحمەد موحەممەد ، پارتە ڕامیاریەکان.
- ڕێبین ڕەسولّ ئیسماعیل ، سیستەمی سیاسی.
- دێڤد بینهام/ کوین بویل ، و. ئەبوبەکر خۆشناو ، ئازادی دیموکراسی و کۆمەڵی مەدەنی.
- بەهادین ئەحمەد موحەممەد ، تیۆری دەوڵەت و سیستەمە ڕامیاریەکان.
- بورهان قانع ، فەرهەنگی نویّ.
- بەختیار جەبار شاوەیس ، ئۆپۆزسیۆن لە چەمکەوە بۆ ئەرك.
- عەبدول ئیلاه بەلقزیز ، ئۆپۆزسیۆن و دەسەلات ، و: هەڵکەوت عبدالله.
- د. سالار باسیرە ، دەسەلاتی سیاسی ، توێژینەوەی زانستی.
- دلێر مستەفا حەسەن ، ڕۆلی حیزبە سیاسیەکان لە بەرەوپێش بردنی کۆمەڵی کوردیدا.
- ئەحمەد صالح ، ڕێکخستن و ڕێکخستنی سیاسی.
- ئازاد وەڵەد بەگی ، فەرهەنگی ڕامیاری نیگا.

**سەرچاوەکان بە زمانی عەرەبی**

- محمود خیری عیسی ، النظم السیاسیه المقارنه.
- محمد السویدی ، علم الاجتماع السیاسی.
- د. شعبان الطاهر الاسود ، علم الاجتماع السیاسی.
- طارق علي الربیعي ، الاحزاب السیاسیه.
- د. طارق علی الهاشمی ، الاحزاب السیاسیه ، وزاره التعلیم العالی و البحث العلمی.

**ڕۆژنامەکان**

- کوردستانی نوێ ، ٧,١٢,٢٠٠٣
- دەستور ، ژماره ٣٨ ، ٣٠,٦,٢٠١٠.

**گۆڤارەکان**

- گۆڤاری سڤیل ، ژماره ٣٤.
- سالار باسیره ، تۆتالیتاریزم لە سیستەمی سیاسیدا ، توێژینەوەی زانستی ، گۆڤاری زانکۆ بەشی B ، زانستە مرۆڤایەتیەکان ، ژماره ٢٣.

**سایتەکان**

- سایتی سبەی ، ٩,٨,٢٠١١.

# سەرچاوەکان بە زمانی ئەڵمانی


- Christian Starck, Politische Parteien in westlichen Demokratien.
- Fadil Rasoul, Irak-Iran.
- Fadil Rasoul, Irak-Iran.
- Faschismus; Ursachen und Politik des deutschen Faschismus.
- Giovanni Sartori - Parteien und Parteiensysteme.
- Hans J. Lietzmann: Politikwissenschaft im 'Zeitalter der Diktaturen'. Die Entwicklung der Totalitarismustheorie Carl J.Friedrichs.
- Hans Ritscher, Welt der Politik.
- Hans Boldt, Nordrein-Westfalen.
- Klaus von Beyme und andere, Band 2, Politikwissenschaft.
- Kleines Lexikon der Politik.
- Klaus von Beyme, politik.
- Kramm, Lothar: Grundzüge einer Theorie der politischen Opposition. In: Zeitschrift für Politik..
- Max Weber, Wirtschaft und Gesellschaft.
- Nils C. Bandelow, Einführung in das politische System der BRD.
- Peter Lösche: Opposition und oppositionelles Verhalten in den Vereinigten Staaten.
- Peter Pawelka, Herrschaft und Entwicklung im Nahen Osten.
- Reinhard Kuhn, Welt der Politik, Berlin.
- Samir al Khalil, Republic of Fear.
- Unsere Zeit, Berlin.
- Wolfgang Laskowski, Macht und Herrschaft, Seminararbeit, WS 2001/02, Manuskript.

## ئینتەرنێت

- www.lerntippsammlung.de/Entwicklung-des-deutschen-Parteiensystems-nach-1945.html
- http://de.wikipedia.org/wiki/Politische_Partei.
- www.bpb.de/.../LIS62C,0,Parteiensystem_der_Bundesrepublik_Deutschland.html–
- http://de.wikipedia.org/wiki/Au%C3%9Ferparlamentarische_Opposition.
- de.wikipedia.org/wiki/Koalitionsregierungen_in_Deutschland
- de.wikipedia.org/wiki/Parteienfinanzierung
- de.wikipedia.org/wiki/Die_Linke.
- de.wikipedia.org/wiki/Bündnis_90/Die_Grünen.
- rg/wiki/Zeit_des_Nationalsozialismus.
- www.bpb.de/.../KR1MEJ,0,0,Das_Parteiensystem_der_BRD_und_sei.
- de.wikipedia.org/wiki/Zweiparteiensystem.
- http://www.almaniya-iraq.org.